# ژیانی هاوەڵان بۆ نەوجەوانان-بەشی دووەم

نووسینی:  نیهاد جلال حبیب الله

مافی لە چاپدانەوەی پارێزراوە بۆ نوسینگەی تەفسیر

چاپی دووەم  ٢٠٢٢ز-١٤٤٣ك



نوسینگەی تەفسیر
بۆچاپ و بڵاوکردنەوە
هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر
حبیب الله ،  نیهاد جلال
ژیانی هاوەڵان بۆ نەوجەوانان-بەشی دووەم،  نیهاد جلال حبیب الله (نووسەر).
٢٦٠ لاپەڕە،
١٤* ٢١ سم
بابەت، مێژوویی، ئاینیی
ISBN: 978-9922-654-71-3

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (٢٤٩) ی ساڵی ٢٠٢٠ پێدراوە.

"بیروبۆچونی ئەم کتێبە، مەرج نیە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"

دیزاین:  نوسینگەی تەفسیر

## پێشکەشە:

* بەوەی نزایەکی خێر بۆ باوکی ئازیزم و دایکی میهرەبانم دەکات.

* بە خوشک و براکانم، هاوسەر و منداڵەکانم، برازا و خوشکەزاکانم.

* بە هەموو منداڵێکی سەر ئەم زەوییە.

* بەو مامۆستایانەی یەکەم پیتی خوێندنیان فێرکردووم، تا ئەمڕۆ.

* بەو کەسەی لە نزای خێر بێبەشم ناکات.

# پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە، خوایە هەموو ستایشێک بۆ تۆ، خوایە هەموو سوپاسێ بۆ تۆ بەو جۆرەی شیاوی شکۆ و گەورەییتە، سەڵات و سەلامی خوا بۆ سەر پێغەمبەری خۆشەویست و ئازیزمان (محمد) بە دایک و باوکەوە بەقوربانی بین. سەڵات و سەلامی خوا لە ئالوبەیتی پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی دەوری.

ئەم نووسینەی بەردەستتان، هەوڵێکی سەرەتاییە، هەتا بتوانین لە ژیانی پێغەمبەرەوە(ﷺ)، تا ئەمڕۆ بڕێ نموونەی کەسە گەورە و خواناسەکان بخەینە بەردەستی منداڵە ئازیزەکانمان، تا بتوانن پێشەنگییان پێوە بکەن و درێژە بەو ڕێبازە بدەن، بەرگی یەکەمی تایبەت کراوە بە ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) و چەند جارێک چاپ کراوە، بەرگی دووەمیشی تایبەت بوو بە خەلیفەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، بەرگی سێهەمیشی تایبەت بوو

بە هاوەڵان کە ژیانی پازدە هاوەڵی لەخۆدەگرت، بەرگی چوارەمیشی تایبەت بوو بە هەڵکەوتەکانی ئیسلام و تیایدا ژیانی یازدە هەڵکەوتەی ناو مێژووی ئیسلامی باسکرابوو، هەریەک لەوانەش دوو جار چاپ کران، بەڵام بە پێویستمان زانی ئەم بەرهەمە دەوڵەمەندتر بکەین، بۆیە بەم چەشنە گۆڕانکاریمان تێدا کرد:

بەرگی یەکەممان تایبەت بە ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) هێشتەوە.

بەرگی دووەممان لەگەڵ ژیانی هاوەڵانی تر یەکخست و تیایدا جگە لە پێنج خەلیفەکە، ژیانی پازدە هاوەڵیشمان داناوە.

بەرگی سێهەم درێژە پێدەری ژیانی هاوەڵانە و تیایدا ژیانی چل و پێنج هاوەڵی تری تێدایە، واتە بە خەلیفەکانیشەوە ژیانی شەست و پێنج هاوەڵ باسکراوە.

بەرگی چوارەممان تایبەت کرد، بە هەڵکەوتەکانی ئیسلام و لە بری یازدە کەسایەتی، ژیانی سی هەڵکەوتەی ناو مێژووی ئیسلامیمان باسکردووە.

هاوەڵانی دەوری پێغەمبەر(ﷺ) خۆشەویستی خوا بوون و خوا لەوان ڕازی و ئەوانیش لەخوا ڕازی بوون، هەر ئەوان بوون وەک

پەپولە بە دەوری پێغەمبەردا (ﷺ) دەهاتن و دەچوون و خۆیان کرد بە پردێک، تا ئەم ئایینەی خوا بگەیەنن بە سەرجەم مرۆڤایەتی.

هەر ئەوان بوون پشتیان کردە چێژە کاتیەکان و بەرگەی سەختیەکانیان گرت لە پێناو ڕازی کردنی خواو ڕزگارکردنی مرۆڤایەتیدا.

بۆیە بەڕاستی پێویستە ئەوانە بکەینە سەرمەشق بۆ خۆمان و منداڵ و نەوەکانمان، تا ڕێی سەرفرازی بگرین.

لێرەدا ژیانی هاوەڵانی خۆشەویستمان بە نموونە هێناوە و لە شێوەی گێڕانەوەی ژیانیان و پرسیار و وەڵام و پەند و ئامۆژگاریدا ژیانی هەرکام لەوانمان هێناوە، دواجاریش کۆمەڵێک پرسیارمان داناوە، تا منداڵی ئازیز بەدوای وەڵامەکانیاندا بگەڕێت کەوەڵامەکانیشیان لە خودی ئەم نووسینەدا هەن.

بەو هیوایەی خوای گەورە ئەم کارەی لێوەرگرتبین و پاک و پوخت تەنها لەپێناو خۆیدا بێت.

خەڵکیش بە گشتی و منداڵی موسڵمان بە تایبەتی سوودی لێ ببینن و ئەو هاوەڵانە بکەنە پێشەنگی ژیانیان، بە ئومێدی

ئەوەش هەر کەس ئەو نووســـینە دەخـــوێنێتەوە، ئەگەر تەنهـــا بە یەک نزاش بێت ئەم بەندەی خوایە، لە نزا بێ بەش نەکات.

﴿إِنْ أُرِيدُ إِلاَّ الإِصْلاَحَ مَا اسْتَطَعْتُ وَمَا تَوْفِيقِي إِلاَّ بِاللّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ﴾

نهاد جلال حبيب الله

## ١- عبدالله بن زبیر (رضي الله عنه)

ناوی (عبدالله بن زبیر)ە و یەکێکە لە هاوەڵە گەنجەکانی دەوری پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، (زبیر)ی باوکی یەکێک بوو لە هاوەڵە ناسراوەکانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و لەم کتێبەدا ژیانەکەیمان باسکردووە.

دایکیشی ناوی (أسماء بنت أبوبکر) بوو کە یەکێک بوو لە ئافرەتە زۆر خواناسەکان و خوشکە گەورەی (عائشة)ی دایکی باوەڕداران بوو.

(عبدالله بن زبیر) لە یەکەم ساڵی کۆچیدا لەدایک بوو و یەکەم مناڵی لەدایکبووی کۆچەران بوو پاش کۆچ بۆ (مدینة).

(عبدالله) تەمەنی نزیکەی حەوت، یان هەشت ساڵان دەبوو کە (زبیر)ی باوکی بردی بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، تا بەیعەت بدات. پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کە بینی وا (عبدالله) دێت، بزەیەکی کرد و بەیعەتی لێوەرگرت.

(عبدالله) لە سەردەمی خیلافەتی (أبوبکر الصدیق)دا هێشتا

تەمەنێکی کەمی هەبوو، لەو ماوە و دواتریشدا (عائشة)ی پووری زۆر نازی دەکێشا، هاوکات سوودێکی زۆری وەردەگرت لە زانستی دایکی باوەڕداران (عائشة). (عروة)ی برای (عبدالله) دەڵێت: خۆشەویستترین کەس لای (عائشة) لە دوای پێغەمبەر(ﷺ) و (أبوبکر)ەوە (عبدالله بن زبیر) بوو.

(عبدالله) لە سەرەتای تەمەنی پێگەیشتنیدا بوو کە هاودەم بە باوکی بەشداری جەنگی یەرمووکی کرد.

جارێک (عمر بن الخطاب)چوو بە کۆڵانێکدا کە بڕێک منداڵ یارییان دەکرد و (عبدالله)ش لەنێویاندا بوو، منداڵەکان هەموو ڕایانکرد تەنها (عبدالله) نەبێت.

(عمر بن الخطاب)وتی: بۆچی تۆش ڕاتنەکرد؟

(عبدالله) وتی: تاوانم نەکردووە، تا لێت بترسم، ڕێگەکەش تەسک نییە، تا ڕێت بۆ فراوان بکەم.

(عبدالله) لە سەردەمی (عثمان بن عفان)دا بەشداری جەنگی دژ بە بێباوەڕانی کرد و ڕۆڵێکی گەورەی بینی، هەروەها بەشداری کرد لە نووسینەوەی قورئاندا.

لەو کاتەی (عثمان بن عفان) لەلایەن ئاشوبگێڕ و خراپەکارەکانەوە گەمارۆ درا، (عبدالله بن زبیر) هاودەم بە (إبن عمر) و (حسن) و (حسین) و چەند گەنجێکی تر وەستان، تا بەرگری لە خەلیفە بکەن، خەلیفەش سوێندی دان کە وازبهێنن و

بچنەوە ماڵەوە، بەڵام (عبدالله) و (حسن)ی کوڕی (علي) نەچوونەوە و بەرگرییان لێکرد، (عبدالله) چەندین شمشێر و تیری بەرکەوت و زۆر بریندار بوو، هەروەها (حسن بن علي)ش بریندار بوو.

کاتێک (زبیر)ی باوکی شەهید کرا، ئینجا (عبدالله) دەستی کرد بە دانەوەی قەرزەکانی باوکی، (زبیر) دەڵێت حیسابم کرد قەرزەکانی نزیکەی ملیۆنێک و دووسەد هەزار دەبوو، ئەوەبوو پشتی بە خوا بەست و دەستی کرد بە دانەوەی قەرزەکان.

لە سەردەمی (معاوية بن أبو سفيان)دا (عبدالله) و (حسن بن علي) چوون بۆ لای (معاوية)، (معاوية) کە (حسن)ی بینی، وتی: مەرحەبا لە نەوەی پێغەمبەر(ﷺ). ئینجا فەرمانی کرد سێ سەد هەزاری پێ بدرێت، بە (عبدالله)شی وت مەرحەبا لە پوورزای پێغەمبەر(ﷺ) و فەرمانی کرد سەد هەزاری پێ بدرێت.

پاش مردنی (یزید) و مردنی (معاوية)ی کوڕیشی، ئیتر بۆشاییەک لە دەسەڵاتدا دروست بوو، بۆیە (عبدالله) بڕیاری دا ببێتە خەلیفەی موسڵمانان، بەڵام لەولاوە (مروان بن الحكم)یش دەیویست ببێت بە خەلیفە، جەنگ لە نێوانیاندا ڕوویدا و پاش جەنگ و خوێن ڕژانێکی زۆر دواجار (عبدالله) شەهید بوو و کۆتایی هات بە دەسەڵاتەکەی.

**پەند و وانە:**

زۆر پێویستە موسڵمانانی ئەمڕۆ سوود پەند وەربگرن لە هەڵەی موسڵمانان لە مێژوودا و نەهێڵن ئەو هەڵانە دووبارە بکرێنەوە، بەتایبەت لە مەسەلەی ناکۆکی نێوان موسڵماناندا، چونکە ناکۆکی نێوان موسڵمانان دەبێتە هۆی بەهێزی دوژمنەکەیان و لاوازبوونی خۆیان و لەدەستدانی شان و شکۆی موسڵمانان.

**پرسیار:**

١- (عائشة)ی هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ) چی (عبدالله) بوو؟

٢- (عبدالله) لە سەردەمی پێشەوا (عثمان)دا چ ڕۆڵێکی بینی؟

٣- پاش شەهید بوونی (زبیر)، (عبدالله) چی کرد؟

٤- بۆچی (عبدالله) ویستی ببێت بە خەلیفە؟

٥- ناکۆکی نێوان موسڵمانان دەبێتە هۆی چی؟

## ٢- (أم سلمة)
## (دایکی باوەڕداران) (رضی الله عنها)

یەکێک لە خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ناوی (هند بنت أبي أمية)یە و بە (أم سلمة) ناسراوە، باوکی زۆر بەخشندە و بە سەخاوەت بوو.

پرسیار: بۆچی بە (أم سلمة) دەڵێین دایک؟

وەڵام: چونکە هەموو خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دایکی هەموو موسڵمانانن، ئەمەش لە قورئانی پیرۆزدا باسکراوە، بۆیە دەبێت وەک دایکی خۆمان ڕێزیان بگرین و نەهێڵین کەس قسەی ناڕەوایان بەرانبەر بکات.

ئەم هاوەڵە زۆر زوو لە (مكة) هاودەم بە (أبو سلمة)ی مێردی موسڵمان بوو و پێکەوە کۆچیان کرد بۆ (حبشة)، لەوێ لە وڵاتی غەریبیدا منداڵێکیان بوو ناویان نا (عمر)، دواتر گەڕانەوە بۆ (مكة)و لەوێوە کۆچیان کرد بۆ (مدينة).

(أم سلمة) کوڕێکی تری هەبوو بەناوی (سلمة) و

کچێکیشی هەبوو بە ناوی (زینب).

(أم سلمة) دەڵێت جارێک بە (أبو سلمة)م وت: بیستوومە ئافرەت کە مێردەکەی مرد و لە دەستەی بەهەشتیەکان بوو و ئافرەتەکەش بەهەشتی بوو و شووی نەکردەوە، خوا لە بەهەشتدا کۆیان دەکاتەوە، بۆ پیاویش هەروا، دەی وەرە، با من بەڵێنت پێ بدەم دوای تۆ شوو نەکەم و تۆیش دوای من ژن نەهێنیت. (أبو سلمة) وتی: گوێڕایەڵم دەبیت؟

منیش وتم: فەرمان بکە، تا گوێڕایەڵت بم.

(عبدالله) وتی: ئەگەر من مردم شوو بکە. دواتر وتی: خوایە، دوای من پیاوێکی باشتر ببەخشە بە (أم سلمة) کە دڵتەنگ و ناڕەحەتی نەکات، ئەوەبوو کە (أبو سلمة) مرد، پێغەمبەر(ﷺ) داوای (أم سلمة)ی کرد.

(أبو سلمة)ی مێردی یەکێک بوو لە بەشداربوانی غەزای بەدر، دواتریش لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد و لە ئوحوددا بریندار بوو، دوای ماوەیەک برینەکەی جەنگی ئوحودی تەقی و بەو هۆیەوە وەفاتی کرد.

دوای ئەوە (أبوبكر) داوای (أم سلمة)ی کرد، بەڵام شووی پێ نەکرد، ئینجا (عمر) داوای کرد و شووی بەویش نەکرد، دواتر پێغەمبەر(ﷺ) داوای کرد و شووی کرد بە پێغەمبەر(ﷺ).

(أم سلمة) دەڵێت وتم: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ئایا، ئەگەر

یارمەتی و بەخشش بدەم بە منداڵەکانی (أبو سلمة) خێرم دەگات؟ چونکە ئەوانە منداڵی منیشن، فەرمووی: (پێیان ببەخشە، لەسەر بەخششت بۆیان پاداشتت وەردەگریت).

**پەند و وانە:**

لە جوانییەکانی ئیسلام ئەوەیە کە هەر کارێک بکەیت مادەم کارەکە دروست بێت و مەبەستت ڕەزامەندی خوا بێت، ئەوە پاداشتی لەسەر وەردەگریت، تەنانەت دایکێک کە خواردن ئامادە دەکات، یان باوکێک کە خواردن دەکڕێت، یان کچێک جلێک دەشوات، یان کوڕێک کاسبی دەکات، هەموو ئەوانە لای خوا پاداشتیان لەسەرە و دەبنە هۆی چوونە بەهەشتی ئەو کەسانە.

جارێک (جبریل) لە شێوەی (دحیة کەلبیدا هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) کە لای (أم سلمة) بوو، لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ) قسەی کرد و دواتر ڕۆشت. پێغەمبەر(ﷺ) بە (أم سلمة)ی فەرموو: ئەوە کێ بوو؟ وتی: ئەوە (دحیة) بوو، دوای ماوەیەک پێغەمبەر(ﷺ) لە وتاردا باسی کرد کە (جبریل) هاتووە بۆ لای، ئینجا (أم سلمة) زانی کە ئەو کەسەی بینیویەتی (دحیة) نەبووە، بەڵکو (جبریل) بووە.

(أم سلمة) لە غەزای تەبووکدا هاودەم بە پێغەمبەر(ﷺ)

بەشداری کرد، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) لە دەرچوونەکانیدا هەرجارەو یەکێک لە ژنەکانی لەگەڵ خۆی دەبرد.

(أم سلمة) کۆتا خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو کە وەفاتی کرد. هێندە ژیا، تا شەهیدبوونی (حسین بن علي) بیست و دڵتەنگیەکی زۆر دایگرت، کەمێک پاش ئەو ڕووداوە وەفاتی کرد. تەمەنی نزیکەی نەوەد ساڵ دەبوو، تەرمەکەشی لە بەقیع ئەسپەردە کرا.

(أم سلمة) یەکێک بوو لە ئافرەتە زاناکانی ناو هاوەڵان و موسڵمانان دەچوون سەبارەت بە مەسەلەکان پرسیاریان لێدەکرد و ئەویش وەڵامی دروستی پێ دەدان.

**پرسیار:**

١- بۆچی (أم سلمة) چوو بۆ (حبشة)؟

٢- مێردەکەی (أم سلمة) ناوی چی بوو؟ چۆن مرد؟

٣- (أم سلمة) چ پرسیارێکی کرد لە پێغەمبەر(ﷺ)؟

٤- (أم سلمة) چۆن (جبریل)ی بینی؟

٥- بۆچی بە (أم سلمة) دەڵێین دایک؟

## ٣- (جابر بن عبدالله)(رضي الله عنه)

ئەم هاوەڵەی پێغەمبەر(ﷺ) یەکێکە لە هاوەڵە پشتیوانەکان، هەم خۆی و هەم باوکیشی هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوون، ئەم هاوەڵەش ناوی (جابر بن عبدالله)یە.

باوکی (جابر) یەکێک بوو لەو هاوەڵە پشتیوانیانەی زۆر زوو موسڵمان بوو و لە بەیعەتی عەقەبەدا بەشداری کرد و یەکێکیش بوو لە نەقیبەکان، دایکی (جابر)یش ناوی (أنیسة) بوو.

(جابر) هاودەم بە باوکی بەشداری بەیعەتی عەقەبەی دووەمی کرد، تەمەنیشی لە هەموویان کەمتر بوو.

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی کرد بۆ (مدینة) تەمەنی (جابر بن عبدالله) نۆزدە، یان بیست ساڵ بوو، واتە لە گەرمەی لاوێتیدا بوو.

(جابر) لە غەزای بەدر و ئوحوددا بەشداری نەکرد، بەڵام لە هەموو غەزاکانی دواتردا بەشداری کرد.

پرسیار: بۆچی (جابر) لەو دوو غەزایەدا بەشداری نەکرد؟

وەڵام: چونکە باوکی (جابر) نەیهێشت بەشداری بکات و خۆی بەشداری کرد، تا (جابر) لە ماڵەوە ئاگاداری خوشکەکانی بێت.

(جابر) دەڵێت: جارێک نەخۆش بووم، پێغەمبەر(ﷺ) و (أبوبکر) بە پیادە و بێ سوار هاتن بۆ سەردانم، کاتێک گەیشتنە ئەوێ من لەهۆش خۆم چووبووم، پێغەمبەر(ﷺ) دەستنوێژی گرت و لە ئاوی دەشتنوێژەکەی پرژاند بەسەرمدا، منیش هۆشم هاتەوە بە خۆمدا.

(جابر) دەڵێت: جارێک باوکم فەرمانی کرد وە خواردنێک ئامادە کرا، ئینجا بە مندا ناردی بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، منیش بردم بۆی و پێغەمبەر(ﷺ) لە ماڵی خۆی بوو.

فەرمووی: ئەی (جابر) ئەوە چیە؟ ئایا گۆشتە؟

وتم: نا.

ئەویش فەرمانی کرد و خواردنەکەیان لەدەست گرتم، کاتێک گەڕامەوە بۆ لای باوکم وتی: ئایا پێغەمبەری خوات(ﷺ) بینی؟

وتم: بەڵێ.

وتی: ئایا هیچی وت؟

وتم: بەڵێ، فەرمووی: (ئەی (جابر) ئەوە چیە؟ ئایا گۆشتە؟

باوکم وتی: لەوانەیە پێغەمبەر(ﷺ) حەزی بە گۆشت کردبێت،

چوو گیسکێکی سەربڕی و چاک برژێنرا. ئینجا پێی وتم: بیبە بۆ پێغەمبەر(ﷺ). منیش کە گەیشتمە لای پێغەمبەر(ﷺ) هەر لەو شوێنەی خۆی بوو. فەرمووی: (ئەوە چیە ئەی (جابر)

وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) گەڕامەوە بۆ لای باوکم وتی: ئایا پێغەمبەری خوات(ﷺ) بینی؟

وتم: بەڵێ.

وتی: ئایا هیچی فەرموو؟

وتم: بەڵێ، وای فەرموو. باوکیشم وتی: لەوانەیە پێغەمبەر(ﷺ) حەزی بە گۆشت کردبێت، بۆیە چوو گیسکێکی سەربڕی و چاک برژێنرا. ئینجا پێی وتم: بیبە بۆ پێغەمبەر(ﷺ).

پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە لە بری ئێمە پاداشتی خێری پشتیوانان بداتەوە بەتایبەت (عبدالله بن عمرو بن حرام) و (سعد بن عبادة).

**پەند و وانە:**

بەدیهێنانی حەز و ئاواتی ڕەوای کەسە باشەکان و خزمانمان خێرێکی گەورەیە، ئەگەر بتوانیت ئاواتێکی دروستی موسڵمانێک بەدی بهێنیت، ئەوە پاداشتێکی گەورەت بۆ خۆت

مسۆگەر کردووە، چونکە بەوە دڵخۆشی دەکەیت و دڵخۆشکردنی موسڵمانیش خێرێکی گەورەیە.

کاتێک بڕیار بوو غەزای ئوحود ڕوویدات، (عبداللە) (جابر)ی کوڕی بانگ کرد و وتی: کوڕم ئومێدم هەیە سبەی شەهید بم، جا وەسیەتت بۆ دەکەم لەگەڵ خوشکەکانت باش بە. (جابر) دەڵێت: ئەوەبوو بەیانی باوکم کوژرا و دوو دوو تەرمەکان دەخرانە یەک گۆڕەوە، باوکیشم لەگەڵ کەسێکی تر خرایە یەک گۆڕەوە، شەش مانگ وابوو، دواتر دڵم ئارامی نەگرت و بڕیارم دا بە جیا لەیەک گۆڕدا بیخەمە ژێر خاک، تەرمەکەیم دەرهێنایەوە، بینیم خۆڵ و زەویەکە هیچی بە جەستەی نەکردبوو تەنها تۆزێکی نەرمایی گوێی نەبێت.

(جابر) دەڵێت: کاتێک تەرمی باوکم دانرابوو پۆشاکەکەی سەر دەموچاویم لادەبرد و سەیرم دەکرد و دەگریام، هاوەڵانی پێغەمبەریش(ﷺ) ڕێگریيان لێدەکردم، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگری لێ نەدەکردم. ویستم هەمتر پۆشاکەکەی سەر دەموچاوی لابەرم، بەڵام هاوەڵان نەیانهێشت، ئەوەبوو پێغەمبەر(ﷺ) خۆی لایبرد کە دەموچاوی دەرکەوت دەنگی گریانێک بەرزبوویەوە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوە کێیە؟ وتیان: کچی (عمرو)، واتە: خوشکی (عبداللە)، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (بۆی بگریت، یان نەگریت

بەردەوام فریشتەکان بە باڵەکانیان سێبەری بۆ دەکەن، تا تەرمەکەی هەڵدەگرن).

**پەند و وانە:**

شـەهیدی لە ڕێـی خـوادا دەسـتکەوتێکی گەورەیە و خـوای گەورە بە هەمـوو کەسـی نابەخشـێت، بـۆیە دەبێـت یەکێـک لە ئاواتەکانمان شەهید بوون بێت، تا خێر و چاکەی شەهیدیمان بەر بکەوێت.

(جابر) دەڵێـت: دوای مەرگـی بـاوکم خەڵکێـک قەرزیـان لای بـاوکم بـوو، منـیش داوام لە پێغەمـبەر(ﷺ) کـرد داوا لە خـاوەن قەرزەکـان بکـات لە قەرزەکەیـان خـۆش بـن، پێغەمـبەریش(ﷺ) داوای کرد لێیان، بەڵام ئەوان ڕازی نەبوون. پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووم: (بڕۆ و خورماکەت بەش بەش بـکە ... ، ئینجا بنێرە بە شـوێنمدا)، منـیش چـووم و وامکـرد و دواتـر هەواڵـم نـارد بـۆ پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش هات و لە سەروو، یان لە لای ناوەڕاستی خورماکـانەوە وەسـتا، پاشـان فەرمـووی: (بیکێشـە بـۆ خەڵـک)، منـیش بـۆم دەکێشـان، تـا چـی قەرزیـان هەبـوو پێمـدانەوە، ئینجـا خورمـاکەش وەک خـۆی مـایەوە وەک ئەوەی هیچـی لـێ کەم نەبووبێتەوە.

یەکێـک لەو کەسـانەی قەرزی لای (عـبداللـە بـن جـابر) بـوو کـابرایەکی جـوولەکە بـوو، سـی کـۆڵ خورمـای لای (عـبداللـە)

بوو، (جابر) داوای کرد کابرای جوولەکە ماوەیەک لەسەری بوەستێت، بەڵام ئەو ڕازی نەبوو. (جابر) چوو لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ) قسەی کرد، تا لای کابرای جوولەکە سکاڵای بۆ بکات، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) هات بۆ لای کابرای جوولەکە و داوای لێکرد لەبری قەرزەکەی بەرهەمی خورماکەی ئەو ببات، بەڵام کابرا ڕازی نەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) چوویە ناو دارخورماکان و پیایدا تێپەڕ بوو، پاشان بە (جابر)ی فەرموو: (بۆی لێبکەرەوە و ئەوەی هی ئەوە بۆی بکێشە). ئەویش دەستی پێکرد، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە (جابر). سی کۆڵەکەی دا بە کابرا و لە سەروو ئەوەشەوە حەڤدە کۆڵی تر مایەوە، (جابر) هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، تا هەواڵی پێبدات چی ڕوویداوە، کەچی بینی پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی عەسر دەکات، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) نوێژەکەی تەواو کرد (جابر) پێی وت: ئەو زیادەی ماوەتەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: ئەوە باس بکە بۆ (عمر). (جابر)یش چوو بۆ لای (عمر) و هەواڵی ئەوەی پێدا، (عمر)یش پێی وت: من بە دڵنیاییی دەمزانی کاتێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەناو دارخورماکاندا تێدەپەڕی خوا بەرەکەت دەخاتە ناو دارخورماکانەوە.

(جابر بن عبدالله) دەڵێت: لە ڕێیەکدا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بووین و منیش لەسەر وشترێک بووم، لە دوای

خەڵکەکەوە بوو، پێغەمبەریش(ﷺ) بە شتێک کە لە دەستیدا بوو دای لە وشترەکە-بۆ ئەوەی بڕوات- ئیتر وشترەکە پێش خەڵکەکە دەکەوت، ئیتر وای لێهاتبوو جڵەوم دەگرت، تا زۆر نەڕوات. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بە ئەوەندە و ئەوەندە ئەیفرۆشیت و خواش لێت خۆش بێت؟

وتم: پێشکەشت بێت ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ).

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بە ئەوەندە و ئەوەندە ئەیفرۆشیت و خواش لێت خۆش بێت؟

وتم: پێشکەشت بێت ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، منیش شەرمم کرد، چونکە تەنها ئەو وشترەمان هەبوو.

وتم: بەڵێ، دەیفرۆشم، ئەوەبوو فرۆشتم پێی بە مەرجێک، تا دەگەمە (مدینة) پێم بێت.

ئینجا وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من زاوام، مۆڵەتم پێ بدە خێراتر بچمەوە (مدینة). ئەویش مۆڵەتی پێدام، منیش پێش خەڵک بەرەو (مدینة) چووم، تا هاتمەوە (مدینة)، خاڵۆم گەیشت پێم و سەبارەت بە وشترەکە پرسیاری لێکردم، منیش پێم وت چیم پێکردووە، ئەویش سەرکۆنەی کردم، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) هاتەوە وشترەکەم بۆ برد، ئەویش پارەی وشترەکەی پێدام و وشترەکەشی دایەوە بە خۆم.

کاتێک (أبوبکر) بوو بە خەلیفە و لە (بحرین)ەوە سامانێکی

بۆ هات، وتی: کێ لەلایەن پێغەمبەرەوە(ﷺ) بەڵێنێکی پێدراوە، با بێت وەریبگرێت. (جابر)یش چوو بۆ لای (أبوبكر) و وتی: پێغەمبەر(ﷺ) بەڵێنی پێدام، ئەگەر سامانی (بحرين)ی بۆ هات ئەوە و ئەوەم پێبدات، ئاماژەی بە هەردوو مشتی کرد. (أبوبكر)یش وتی: بیبە، ئەویش بە هەردوو مشتی هەڵیگرت نزیکەی پێنج سەد درهەمی کرد، (أبوبكر)یش ئەو پێنج سەد درهەمە و هەزار درهەمی تریشی پێدا.

دوای سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) (جابر) لە (مدينة) مایەوە و لە مزگەوتی (مدينة)دا بازنەی وانەوتنەوەی هەبوو و خەڵکی زانستیان لێ وەردەگرت، هەروەها (جابر بن عبدالله) موفتی (مدينة) بوو.

لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا (جابر بن عبدالله) چوو بۆ (مكة) و ماوەیەک لەوێ بوو، ئینجا گەڕایەوە بۆ (مدينة).

(جابر بن عبدالله) ماوەیەک پێش مردنی بینایی چاوەکانی لەدەست دا، تەمەنێکی زۆر ژیا و تەمەنی لە نەوەد ساڵ زیاتر بوو، دواجار لە (مدينة) وەفاتی کرد.

**پرسیار:**

١- باوكی (جابر) كێ بوو و كەی، شەهید بوو؟

٢- بۆچی (جابر) بەشداری غەزای بەدرو ئوحودی نەكرد؟

٣- بەسەرهاتی وشترەكەی (جابر) چۆن بوو؟

٤- باسی كۆتاییەكانی تەمەنی (جابر) بكە.

٥- دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) (جابر) لە (مدینة) چی دەكرد؟

## ٤- (ثابت بن قیس)(رضي الله عنه)

یەکێکی تر لە هاوەڵە خۆشەویستەکانی ناو پشتیوانان بریتی بوو لە گەنجێکی بە توانا و گورج و گۆڵ بە ناوی (ثابت بن قیس). ئەم هاوەڵە لە وتاربێژیدا زۆر بەهێز بوو و زۆر جار پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی پێ دەکرد، تا لەناو کۆڕەکاندا وتار بدات.

(قیس)ی باوکیشی یەکێک بوو لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) و ئەو کاتانەی (ثابت)ئامادە نەبوو و (قیس) لای پێغەمبەر(ﷺ) ئامادە بوو و گوێی لە فەرموودەکانی دەگرت، دواتر دەچوو بۆ لای (ثابت)ی کوڕی و فەرموودەی بۆ دەگێڕایەوە و ئەویش دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) فەرموودەکانی دەگێڕایەوە بۆ موسڵمانان.

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) برایەتی خستە نێوان کۆچەران و پشتیوانانەوە، هەریەک لە (عامر بن أبوالبکیر) و (ثابت بن قیس)ی کرد بە برای یەک.

(ثابت)لە غەزای بەدردا بەشداری نەکرد، چونکە نەیزانی پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵان بۆ جەنگ دەچن، بەڵام دواتر لە غەزای ئوحود و هەموو غەزاکانی تریشدا بەشداری کرد.

هەروەها (ثابت بن قیس) نووسەری پێغەمبەر(ﷺ) بوو، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) نامە و بەڵێنێکی دەنووسی بۆ خەڵکێک، یان بۆ هۆزێک، یەکێک لەوانەی نامەکانی بۆ دەنووسی (ثابت)بوو.

جارێک پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی (ثابت بن قیس)ی پرسی و فەرمووی: (کێ هەواڵیم بۆ وەردەگرێت). پیاوێک وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەواڵی وەردەگرم بۆت، ئەوەبوو چوویە ماڵی (ثابت)و سەیری کرد (ثابت)بە بێتاقەتی و کزۆڵی لە ماڵەوە دانیشتووە.

وتی: ئەوە چیتە بۆ وایت؟

(ثابت)وتی: من لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) دەنگم بەسەر دەنگی پێغەمبەردا(ﷺ) بەرز دەکردەوە، هەرکەسیش وابکات کارە چاکەکانی پووچەڵ دەبنەوە و شوێنی دۆزەخە.

کابرا گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەر(ﷺ) کابرای ناردەوە بۆ لای (ثابت) و فەرمووی: بڕۆ بۆ لای و پێی بڵێ: (تۆ لە دۆزەخیەکان نیت، بەڵکو لە بەهەشتیەکانیت). ئەمەش موژدەیەکی زۆر خۆش بوو

بۆ (ثابت) کە هەر لە ژیانی دنیادا موژدەی بەهەشتی پێ درا و خەڵکی دەیانبینی و دەشیانزانی ئەو دەچێتە بەهەشتەوە.

**پەند و وانە:**

دەبێت بەوپەڕی ڕێز و حورمەتەوە لەگەڵ ژیان و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) هەڵسوکەوت بکەین، وەک چۆن هاوەڵان، تەنانەت شەرمیان لەوە دەکرد کە دەنگیان لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بەرز بوایە، ئەوە لووتکەی ڕەوشت و شەرم و حەیایە. بەڕاستی هاوەڵان ئاوا ژیاون بۆیە خوای گەورە لێیان ڕازی بوو و بە هۆی ئەوانەوە ئیسلامی سەرخست و دوژمنانی شکاند، ئەو شەرم و حەیا و ڕێزگرتنە هۆکاری چوونە بەهەشتی (ثابت)و هاوەڵانی تریش بوو.

پێغەمبەر(ﷺ) لە نێو کۆڕ و دانیشتنەکاندا بە هەموانی دەفەرموو فلانە کەس پیاوێکی باشە، ناوی چەند هاوەڵێکی ڕێزداری دەبرد، هەروەها دەیفەرموو: (ثابت بن قیس) پیاوێکی باشە.

کاتێک (مسیلمة الکذاب) هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و داوای لێ دەکرد دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) (مسیلمة) شوێنی بگرێتەوە و ببێتە پێغەمبەر(ﷺ). خێرا پێغەمبەر(ﷺ) بەرپەرچی دایەوە و دواتر (ثابت)ی ڕاسپارد، تا لە بری

پێغەمبەر(ﷺ) وەڵامی (مسیلمة الكذاب) بداتەوە، ئەمەش ئەوپەڕی متمانەی پێغەمبەر(ﷺ) بوو بە پاکی و ژیری و لێزانی (ثابت).

(ثابت)دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیا و لە سەردەمی خیلافەتی (أبوبکر الصدیق)دا لە جەنگی یەمامەدا دژ بە هەڵگەڕاوەکان بەشداری کرد، ئاڵای پشتیوانانی بەدەستەوە بوو، کاتێک دەیبینی کەسانێک دەترسن و تەمبەڵی دەکەن لە جەنگەکەدا دەیوت خوایە، من لەوانە نیم، جەنگێکی سەختی ئەنجامدا، تا دواجار شەهید بوو.

کاتێک (ثابت بن قیس)کوژرا قەڵغانێکی گرانبەهای لەبەردا بوو، کەسێک لە موسڵمانان هات و بردی بۆ خۆی، دواتر (ثابت)چووە خەوی موسڵمانێک و پێی وت: وەسیەتێکت بۆ دەکەم تکام وایە، نەڵێیت خەوە و پشتگوێیی بخەیت. من کە دوێنێ کوژرام کەسێک لە موسڵمانان هات و قەڵغانەکەی بردم و ماڵیشی لەوپەڕی شارەوەیە و لەوێ بەوجۆرە شاردوویەتیەوە، بڕۆ بۆ لای (خالد) و داوای لێ بکە، تا کەسێک بنێرێت ئەو قەڵغانەم وەربگرێتەوە کە چوویتەوە (مدینة) بیبە بۆ لای خەلیفەی پێغەمبەر(ﷺ) و پێی بڵێ من فڵانە قەرز و فڵانە قەرزم لەسەرە و فڵانە کۆیلەشم، با ئازاد بێت، ئەوەبوو کابرا چوو و وایکرد و خەلیفەش وەسیەتەکەی بەجێگەیاند.

**پرسیار:**

١- (ثابت)بە چی ناسرابوو؟

٢- (ثابت)چۆن خزمەتی پێغەمبەری خوای(ﷺ) دەکرد؟

٣- بۆچی (ثابت)لە غەزای بەدردا بەشداری نەکرد؟

٤- پێغەمبەر(ﷺ) بەرانبەر بە (مسیلمة الکذاب) چ ئەرکێکی بە (ثابت)سپارد؟

٥- چۆن قەڵغانەکەی (ثابت)دۆزرایەوە؟

## ٥- (أقرع بن حابس)(رضي الله عنه):

ئەم هاوەڵەی کە باسی دەکەین لە سەردەمانی پێش موسڵمان بوونیدا یەکێک بوو لە کەسە دیار و خانەدانەکان و لەناو هۆزی خۆیدا قسە ڕۆیشتوو بوو، بگرە لە سەردەمی نەفامیدا کەسێکی دەسەڵاتدار بوو.

(أقرع) سەرەتا کەسێکی بێباوەڕ بوو و لە (مكة)دا گاڵتەی دەکرد بە موسڵمانان، جارێک (أقرع) لەگەڵ (عينة)دا بوو، سەیریان کرد پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ (عمار) و (صهيب) و (بلال) و (خباب) و چەند موسڵمانێکی تری لاوازدا دانیشتووە، ئەوانیش گاڵتەیان پێکرد و دەیانوت: کە وەفدی عەرەب دێن شەرم دەکەین بمانبینن لەگەڵ ئەوانەدا دانیشتبیت، ئەگەر هاتین بۆ لات تۆ ئەوانە دەربکە. پێغەمبەریش(ﷺ) خەریک بوو ڕازی بێت بەو هیوایەی ئەوانیش موسڵمان بن، ئەوانیش وتیان: دەی بەڵێنێکمان بۆ بنووسە، ئەویش ویستی بینووسێت و (علي بن

أبو طالب)ی بانگ کرد، تا بینووسێت، ئەوەبوو (جبریل) هات و ئایەتی خوای بۆ هێنا کە تیایدا خوای گەورە ڕێی نەدا پێغەمبەر(ﷺ) وا بکات و فێڵەکەی ئەوانی ئاشکرا کرد. پێغەمبەریش(ﷺ) وەرەقەکەی فڕێ داو ئەو هاوەڵانەی بانگ کردەوە و لەگەڵ ئەواندا دانیشت.

پەند و وانە:

گەورەیی و ڕێزداری بە دەوڵەمەندی و هەژاری نییە، زۆرجار کەسانێکی هەژار و نەدار هەن لای خوا زۆر گەورەتر و خۆشەویستترن لە کەسانێکی دەوڵەمەندی خۆبەزل زان، یان خوانەناس، دەبێت ئێمەش وریا بین لەبەر دڵی ئەو دەوڵەمەندانە دڵی هەژار و لاوازەکان نەڕەنجێنین، با تەنانەت نییەتیشمان چاک بێت و لەپێناو ئەوەدا بێت هەوڵ بدەین ئەو دەوڵەمەند و کەسە بەناوبانگانە موسڵمان بن، هەر نابێت، مافی موسڵمانە هەژار و لاوازەکان بخۆین و وریا بین پشتگوێیان نەخەین.

دواتر (أقرع) لەگەڵ هۆزەکەیدا چووە (مدینة) بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە ئەوکاتە پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی کردبوو بۆ (مدینة)، دوای وتووێژ و قسەکردنێکی زۆر، دواجار (أقرع) و هۆزەکەشی موسڵمان بوون، پێغەمبەریش(ﷺ) بەخششی کردن و جلوبەرگی بە دیاری بەخشی بە هەموویان.

دوای ئەوە (أقرع) هەوڵی دەدا قەرەبووی سەردەمی نەفامی

خۆی بکاتەوە و بەشداری جەنگ و غەزاکانی دەکرد، لە فەتحی (مكة) و حونەین و جەنگی (طائف)دا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بەشداری کرد، لە غەزای حونەیندا پێغەمبەر(ﷺ) سەد وشتری بەخشی بە (أقرع).

کاتێک (علي بن أبو طالىب) لە (یمن)ەوە بڕێک زێڕی نارد، بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش دابەشی کرد بەسەر چوار کەسدا، یەکێک لەو چوار کەسە (أقرع بن حابس) بوو.

جارێک (أقرع بن حابس) لای پێغەمبەر(ﷺ) بوو، سەیری کرد پێغەمبەر(ﷺ) (حسن بن علي) ماچ کرد. (أقرع) وتی: من دە منداڵم هەیە هێشتا یەکێکیانم ماچ نەکردووە، پێغەمبەر(ﷺ) سەیری کرد، پاشان فەرمووی: (ئەوەی ڕەحم و سۆزی نەبێت، ڕەحم و سۆزی بۆ نییە).

**پەند و وانە:**

چاک وایە، ئەگەر برا و خوشک، یان خزمێک، یان کەسێکی موسڵمانمان خۆش ویست، ئەو خۆشەویستیەی خۆمان دەرببڕین نەوەک تەنها لە ناخماندا بێت، چونکە دەربڕینی خۆشەویستی دەبێتە مایەی دڵخۆشی ئەو کەسە و پێغەمبەری خوایش(ﷺ) وایکردووە.

جارێک پێغەمبەر(ﷺ) لەناو هاوەڵانیدا بوو فەرمووی:

(خوای گەورە حەجی نووسیوە لەسەرتان). (أقرع) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا هەموو ساڵێک؟ پێغەمبەر(ﷺ) بێدەنگ بوو، پاشان فەرمووی: ئەگەر بموتایە بەڵێ، ئەوا واجب دەبوو و ئەوکات ئێوەش گوێڕایەڵ نەدەبوون و ملکەچیتان نەدەنواند، بەڵام تەنها یەک حەجتان لەسەر واجبە.

هەروەها (أقرع) هەندێ جار وەک شایەت ئامادەی نووسین و نامەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو بۆ خەڵک و هۆز و ناوچەکان.

دوای ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد، (أقرع) لەسەر موسڵمانبوونەکەی خۆی بەردەوام بوو و لە نوێژ و پەرستشدا بەردەوام بوو و بەشداری جەنگی دژ بە بێباوەڕانی دەکرد، لەگەڵ خۆیشیدا کوڕەکانی بەشداری جەنگیان دەکرد، دواجار لە جەنگی یەرمووکدا کوژرا و هەر دە کوڕەکەیشی لەگەڵیدا بەشداری ئەو جەنگە بوون.

**پرسیار:**

١- کاتێک (أقرع) بێباوەڕ بوو چی دەکرد؟

٢- باسی موسڵمانبوونی (أقرع) بکە.

٣- کاتێک (أقرع) وتی منداڵەکانم ماچ ناکەم پێغەمبەر(ﷺ) چی پێ فەرموو؟

٤- (أقرع) کەی و چۆن مرد؟

٥- دەتوانیت چوار سوود لە ژیاننامەی (أقرع) بنووسیت؟

## ٦- (حذيفة بن اليمان)(رضي الله عنه)

ئەم هاوەڵەی باسی دەکەین ناوی (حذيفة بن اليمان)ە، باوکیشی هاوەڵی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو و لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد، بەڵام بە دەستی یەکێک لە هاوەڵان بە هەڵە کوژرا، دایکیشی هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو و ناوی (رباب بنت كعب) بوو.

(حذيفة) دەڵێت جارێک دایکم پێی وتم: لە کەیەوە نەچوویتەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)؟

منیش وتم: ماوەیەکە. ئەویش لێم تووڕە بوو.

منیش وتم: باشە، ئێستا دەچم بۆ لای پێغەمبەر و نوێژی لەگەڵ دەکەم، بەڵکو داوای لێخۆشبوون بۆ من و تۆیش بکات.

چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و لە دوایەوە نوێژی ئێوارەم کرد، ئینجا کە پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆیشت منیش شوێنی کەوتم،

فەرمووی: ئەوە کێیە؟

وتم: (حذيفة بن اليمان).

فەرمووی: بۆچی هاتویت؟

منیش وتم: دایکم ناردمی. پێغەمبەریش(ﷺ) نزای کرد بۆ خۆم و دایکم و فەرمووی: (خوا لە خۆت و دایکیشت خۆش بێت).

کاتێک (حذیفة) و باوکی ویستیان بەرەو (مدینة) کۆچ بکەن، ڕێیان کەوتە (أبو جهل). (أبو جهل) وتی: بۆ کوێ دەچن؟

ئەوانیش وتیان: هەروا دەڕۆین.

ئەویش وتی: دەزانم بۆ پاڵپشتی (محمد) دەچن. بۆیە بەڵێنی وەرگرت لە هەردووکیان نەبنە دوژمنی قورەیشیەکان و بەشداری جەنگ نەکەن، ئەوەبوو کە باوک و کوڕ چوون بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕایەوە، ئەویش فەرمانی کرد بەڵێنەکەیان ببەنەسەر و بەشداری غەزای بەدر نەکەن.

**پەند و وانە:**

زۆر پێویستە ئێمەی موسڵمان گرنگی بدەین بە بەڵێنەکانمان و ناپاکی نەنوێنین، بەڵکو تەنانەت ئەگەر بەڵێنی ئەوەمان دا لە شوێنێ ئامادە بین هیچ دوا نەکەوین، یان بەڵێنمان دا کارێک بکەین، ئەگەر کارەکە خراپ نەبوو هەر دەبێت بیکەین و بەڵێنەکەمان نەشکێنین. سەیرکە چۆن پێغەمبەر(ﷺ) نەیهێشت

ئەو دوانە بەڵێنی خۆیان بەرانبەر بە دوژمنانی ئیسلامیش بشکێنن.

(حذیفة) هاودەم بە باوکی لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد، بەڵام باوکی بە دەستی یەکێک لە هاوەڵان کوژرا، ئەو هاوەڵە نەیناسیەوە و وایزانی لە بێباوەڕانە، چونکە سوپای موسڵمانان زۆریان دەموچاویان داپۆشیبوو، بۆیە دەبوو نیشانەیەکیان هەبوایە، تا بناسرێنەوە. (حذیفة) کاتێک بینی هێرش برا بۆ باوکی هاواری دەکرد باوکم باوکم، بەڵام دەنگی نەگەیشت و باوکی بە هەڵە کوژرا، دواتر (حذیفة) خوێن بایی باوکی وەرنەگرت و لە موسڵمانان خۆش بوو.

(حذیفة) لە غەزای خەندەقیشدا بەشدار بوو و لەگەڵ (سلمان) و (عمرو) و (نعمان) و چەند هاوەڵێکی تری پشتیواناندا لە بەشێکی خەندەقەکەدا سەرقاڵ بوون، تا ئەوەی بەردێکی گەورەی سپییان هاتەڕێ و پێغەمبەریان(ﷺ) بانگکرد و ئەو شکاندی.

(حذیفة) لە غەزای خەندەقدا نێردراوی پێغەمبەر(ﷺ) بوو بۆ هەواڵ وەرگرتنی دوژمن، ئەوەتا خۆی بەسەرهاتەکە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: لە خەندەقدا ڕەشەبا و سەرمایەکی سەخت بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەرێ کەسێک هەیە هەواڵی دوژمنم بۆ بهێنێت، تا لە ڕۆژی دواییدا خوا لەگەڵ من بیهێڵێتەوە؟)

ئێمەش هەموو بێدەنگ بووین و کەسمان نەچووین، پێغەمبەر(ﷺ) دووبارە هەمان شتی دووبارە کردەوە و ئێمەش هەر بێدەنگ بووین، پێغەمبەر(ﷺ) بۆ جاری سێیەم ئەوەی دووبارە کردەوەو ئێمەش هەر بێدەنگ بووین، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەی (حذیفة) هەستە بڕۆ هەواڵی دوژمنمان بۆ بهێنە). منیش ئیتر چارم نەما، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) بە ناوهێنان ناوی هێنام، تا هەستم و بڕۆم. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بڕۆ هەواڵی دوژمنم بۆ بهێنە و مەیان ورووژێنە لێم) ترس و بیمێکی زۆرم هەبوو، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا(ﷺ) نزای بۆ کردم و فەرمووی: (خوایە، لە بەردەم و دواوە و ڕاست و چەپیەوە بیپارێزیت). ئیتر سوێند بەخوا چی ترس و بیم لە دڵمدا هەبوو هیچی نەما. منیش چووم و زۆر بە وریایی و لەسەرخۆیی دەچووم، تا چوومە ناویانەوە، (أبو سفیان)م بینی پشتی کردبووە ئاگرەکە و پشتی گەرم دەکردەوە، کەسێکی گەورە و کەڵەگەت بوو و منیش ئەوکات نەمدەزانی (أبوسفیان)ە، ئەو دەیوت دەبێت بڕۆین، منیش تیرێکم خستە ناو کەوانەکەوە و ویستم بیکوژم، بەڵام فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوام(ﷺ) بیر کەوتەوە کە فەرمووی: مەیان ورووژێنە لێم، بۆیە نەمکوشت، ئەگینا بۆم بهاویشتایە بە دڵنیاییەوە دەمپێکا. ئینجا چوومە نێوان دوو کەسیانەوە، کابرایەک وتی: ئەمشەو

هەواڵگر و شت دێن، بۆیە هەرکامتان پرسیار بکەن لەوەی پاڵ خۆتان بزانن کێیە؟ منیش خێرا بەوەی لای ڕاستم وت تۆ کێیت؟ بەوەی لای چەپیشم وت تۆ کێیت؟ ئینجا دواتر گەڕامەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و هەواڵەکانم پێدا، سەرمایەکی سەختیشم چەشتبوو، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) عەبایەکی پێبوو کە نوێژی پێوە دەکرد ئەو عەبایەی دا بەسەرمدا، خەوم لێکەوت، تا بەیانی هەڵنەستام کە بەیانی هەستام پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (هەستە خەواڵوو).

هەروەها (حذیفة) لە غەزای تەبووکیشدا بەشدار بوو، جا کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) لە تەبووکەوە بەرەو (مدینة) دەگەڕایەوە، دەستەیەک لە دووڕووان ویستیان پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەناوبەرن و لە سەروو عەقەبەوە فڕێی دەنە خوارەوە، پێغەمبەری خواش(ﷺ) هەواڵی ئەوەی زانیبوو، ئەوەبوو فەرمانی کرد، خەڵکی بچن و خۆی لەگەڵ دەستەیەک لە عەقەبەوە سەرکەوت، ئەو دەستە دووڕووەش دەموچاویان داپۆشیبوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد، هەریەک لە (عمار) و (حذیفة) لەگەڵی بڕۆن، ئەو دوانەش بە پیادە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) چوون، کاتێک ئەو دەستەیە ناپاکییان نواند پێغەمبەر(ﷺ) تووڕە بوو و (حذیفة)ش تووڕەییەکەی پێغەمبەری خوای (ﷺ) بینی، بۆیە گەڕایەوە بۆیان و کەوتە

لێدانیان، ئەوانیش زانییان دەستەکەیان ئاشکرا بووە، خێرا خۆیان تێکەڵ کردەوە بە خەڵکەکە، ئینجا (حذيفة) گەڕایەوە و پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمانی کرد خێرا بکەن، تا عەقەبەیان بڕی و چاوەڕێی خەڵکەکەیان کرد. پێغەمبەر(ﷺ) بە (حذيفة)ی فەرموو ئەو خەڵکەت ناسییەوە؟ ئەویش وتی: تەنها سوارەکانیان، دەناسمەوە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) بەسەرهاتەکەی باس کرد بۆ (حذيفة) و ناوی ئەو دووڕووانەی فەرموو بە (حذيفة) کەکێ و کێ بون.

(حذيفة) زۆر جار لە نزیک پێغەمبەرەوە(ﷺ) بوو، جار هەبوو دەبووە شایەتی پەیمانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) کە دەنووسران بۆ هۆزەکان. هەروەها لە میوانداری و کاتی نانخواردنیش جار هەبوو لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بوو، (حذيفة) دەڵێت: ئێمە کە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) نانمان دەخوارد دەستمان نەدەبرد بۆ خواردنەکە، تا پێغەمبەر(ﷺ) دەستی پێدەکرد.

(حذيفة) دوای وەفاتی پێغەمبەری خوایش(ﷺ) ژیا و لە نزیک خەلیفەکانەوە بوو و ئەوانیش ڕاوێژیان پێ دەکرد، هەروەها دەچوو بۆ جەنگی دژ بە بێباوەڕان و بەرپرسیارێتی بەڕێوەبردنی ناوچەکانیش دەگرتە ئەستۆ. بەوجۆرە لە خزمەتکردنی ئیسلام بەردەوام بوو، تا دواجار لە سەردەمی خیلافەتی (علي بن أبو طاليب) دا کۆچی دوایی کرد، لە

کاتی سەرەمەرگەیدا دەیوت: ئەمە کۆتا ساتی ژیانی دنیامە، خوایە، تۆ دەزانیت من تۆم خۆش دەوێت، دەی بەرەکەت بخەرە ساتی گەیشتنەوەم بە تۆ.

**پرسیار:**

١-باوكی (حذيفة) چۆن شەهید بوو؟

٢- بۆچی،(حذيفة) و باوكی بەشداری غەزای بەدر نەبوون؟

٣- كێ ناوی دووڕووەكانی فێری (حذيفة) كرد؟

٤- (حذيفة) لە سەرەمەرگیدا چی دەوت؟

٥- كام ڕووداوی ناو ئەم چیرۆكە لات كاریگەر بوو؟

## ٧- (رقية)ی کچی پێغەمبەر (ﷺ)

ئەم کەسایەتیەی باسی دەکەین کچی پێغەمبەری خوایە(ﷺ). کچی زۆر خۆشەویست و دڵسۆز و خواناسیەتی، ئەویش ناوی (رقية) بوو، دایکی ناوی (خديجة بنت خويلد)ە کە هەر لە دنیادا موژدەی بەهەشتی پێ درا. (رقية) خوشکە بچووکی (زينب) و خوشکە گەورەی (فاطمة) و (أم كلثوم) بوو.

هێشتا ئایینی ئیسلام نەهاتبوو کە یەکێک لە کوڕەکانی (أبولهب) بە ناوی (عتبة) هاتە داوای (رقية)، (رقية)ش خۆی ڕازی بوو، پێغەمبەریش(ﷺ) دڵی کچەکەی نەشکاند، بەڵام کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) پەیامی ئیسلامی بۆ هات و (أبولهب) دژایەتی کرد، ئەو دوژمنەی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە کوڕەکەی، تا (رقية) تەڵاق بدات، (عتبة)ش بە قسەی باوکە بێباوەڕەکەی کرد و تەڵاقی دا.

پرسیار: ئەی، (رقية) دوای ئەوە چی کرد؟

وەڵام: دوای ئەوە (عثمان بن عفان) کە ئەو بەسەرهاتەی

بیست، خێرا چوویە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و داوای (رقیة)ی کرد و پێغەمبەریش(ﷺ) ڕازی بوو و (رقیة)ی لێ مارە کرد. بەو چەشنە خوای گەورە (رقیة)ی لە (عتبة)ی بێباوەڕ ڕزگار کرد و بەخشی بە (عثمان بن عفان) کە یەکێک بوو لەموژدەپێدراوانی بەهەشت.

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتی دا بە موسڵمانان، تا کۆچ بکەن بۆ (حبشة)، (عثمان) و (رقیة) پێکەوە کۆچیان کرد بۆ (حبشة). پێغەمبەر(ﷺ) ماوەیەک هەواڵی ئەوانی نەزانی، هەوڵی دەدا هەواڵیان بزانێت. ئەوەبوو ئافرەتێک هات بۆ لای و هەواڵی (عثمان) و (رقیة)ی پێ بوو، پێغەمبەریش(ﷺ) دڵخۆش بوو بە بیستنی هەواڵەکە، دوای ماوەیەک ئەو ژن و مێردە خواناسە پێکەوە گەڕانەوە بۆ (مکة)، ئەمجارەیان کۆچیان کرد بۆ (مدینة)، هەر لەوێ مانەوە، تا ئەو کاتەی (رقیة) وەفاتی کرد.

**پەند و وانە:**

پێویستە منداڵی سەرکردە و زانای موسڵمانان وەک منداڵانی تر بژین و لە کاتی سەختی و نارەحەتیەکاندا وەک ئەوان بەشداری سەختیەکان بن، تا لە حاڵی میللەت تێبگەن، نابێت ئەوان لەوپەڕی خۆشگوزەرانیدا بن و هاوڵاتیانی تر لە ئازار و

مەینتەیدا بژین، وەک چۆن (رقیة) کە کچی پێغەمبەری خوا بوو هاوشانی موسڵمانانی تر شاری خۆی جێهێشت و کۆچی کرد بۆ وڵاتی (حبشة) کە زۆر لە شارەکەی خۆیەوە دوور بوو و چەندین سەختی و مەینەتی چەشت.

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) دەرچوو بۆ غەزای بەدر (رقیة) نەخۆش بوو، بۆیە (عثمان بن عفان) لای (رقیة)ی خێزانی مایەوە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکرد، تا لای (رقیة) بمێنێتەوە. کاتێک موسڵمانان سەرکەوتن (رقیة) وەفاتی کرد، تا پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە تەرمی (رقیة) ئەسپەردە کرا.

**پەند و وانە:**

ژیان و مردن تەنها بە دەستی خوای گەورەیە و هیچ کەسێکی تر ناتوانێت تەنها چرکەیەکیش ژیانی کەسێک زیاد بکات، یان ژیانی کەم بکاتەوە، بەڵکو تا خوا ویستی لەسەر بێت دەبێت بژین و کەس ناتوانێت لەناومان بەرێت، هەرکات خوا ویستی لەسەر بێت، ئینجا ژیانی دنیا جێدەهێڵین. ئەگەر هەموو دنیا کۆببێتەوە، تا کەسێک لەناوبەرێت، ئەگەر خوا ویستی لەسەر نەبێت ناتوانن بیکوژن، بۆیە دەبێت تەنها پشت بە خوا ببەستین و چاومان لەهێز و توانای خەڵکی نەبێت.

**پرسیار:**

١- (رقية) چەند خوشکی هەبوو؟ ناویان چی بوو؟

٢- بۆچی (عتبة) (رقية)ی تەڵاقدا؟

٣- بەسەرهاتی کۆچکردنی (عثمان) و (رقية) باس بکە.

٤- بۆچی (عثمان) نەچوو بۆ غەزای بەدر؟

٥- (رقية) کەی، وەفاتی کرد؟

## ٨- (خبيب بن عدي)(رضي الله عنه)

هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) جیاواز لەوانی تر لەپێناو ئیسلامدا ناڕەحەتی و ئەشکەنجەی زیاتریان چەشت، یەکێک لەو هاوەڵە خۆڕاگرانەش ناوی (خبيب بن عدي) بوو، (خبيب) لە پشتیوانان بوو. ئەم هاوەڵە خۆشەویستە لە خزمەتی پێغەمبەردا(ﷺ) بوو و هاوشانی هاوەڵانی تر بەشداری غەزای بەدری کرد، ئەو غەزایەی کە یەکەم جار بوو بەرانبەر بە دوژمن بوەستنەوە و جەنگی یەکلاکەرەوە بوو، دوای ئەوەش هەر لە خزمەتی پێغەمبەردا(ﷺ) بوو، تا ئەو کاتەی ماڵئاوایی یەکجارەکی کرد.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دە کەسی لە هاوەڵانی نارد، (عاصم الانصاري) کرد بە سەرگەورەیان کە گەیشتنە ناوچەیەکی نزیک لە (مكة)، تاقمێک لە بێباوەڕان بە نزیکەی دووسەد کەسەوە هاتن و کەوتنە شوێنیان، ژمارەیەک لەوانیان کوشت سێ کەسیشیان لێ بەدیل گرتن، یەکێک لەو سێ کەسە (خبيب) بوو. کاتێک گەیشتنەوە ناوچەی خۆیان خێرا ئەوانیان

بەستنەوە، یەکێکی تر لەو سیانەشیان کوشت، ئینجا (خبیب) و ئەو کەسەکەی تریان برد و ئەوانیان فرۆشتن بە خەڵکی (مکة). ئەوەبوو کوڕەکانی (حارث بن عمرو) (خبیب)یان کڕی، چونکە (خبیب) لە جەنگی بەدردا باوکی ئەوانی کوشتبوو، (خبیب)یان کڕی و بە دیلی لای خۆیان هێشتیانەوە، لە ماڵەوە لە شوێنێک بەندیان کردبوو، تا ئەو کاتەی بیکوژن، خوشکەکەیان لەوێ پاسەوانی بوو. (خبیب) داوای گوێزانی لەو ئافرەتە کرد، تا خۆی پێ پاک بکاتەوە، کوڕێکی ئەو ئافرەتەش لای (خبیب) بوو، (خبیب) لەسەر ئەژنۆی خۆی داینیشاندبوو، ئافرەتەکە دەیوت منیش ترسام بە مووسەکە ئەو کوڕەم ئازار بدات، بۆیە بە ترسەوە بەرەو ئەوێ چووم، (خبیب) کە منی بینی زانی ترساوم، وتی ترسایت ئەم منداڵە بکوژم؟ من شتی وا ناکەم، ئافرەتەکە دواتر دەیوت بەخوا هیچ دیلێکم نەدیبوو هێندەی (خبیب) چاک بێت، سوێند بەخوا ڕۆژێک بینیم هەرچەندە لای ئێمە بەندکراو بوو، کەچی ترێی دەخوارد لەکاتێکدا بە زنجیر بەسترابوویەوە و لەو کاتەشدا لە هەموو (مکة) ترێ دەست نەدەکەوت، بۆیە دڵنیام خوا ئەو ڕۆزیەی بۆ ناردبوو.

پرسیار: ئەی دواتر (خبیب) چی بەسەرهات؟

وەڵام: ئەوان ماوەیەک (خبیب)یان بە بەند کراوی هێشتەوە،

(خبیب) بە یەکێک لەوانەی وت کە بەندیان کردبوو سێ داواکاریم لێت هەیە، ئاوی سازگارم بۆ بهێنیت و گۆشتی حەرامم بۆ نەهێنیت، ئەگەریش ویستیان بمکوژن پێم بڵێیت. ئینجا هاتن و (خبیب)یان برد، تا بیکوژن، (خبیب) وتی: دەرفەتم بدەن، تا دوو ڕکات نوێژ بکەم، ئەوانیش مۆڵەتیان دا. (خبیب) دوو ڕکات نوێژی کرد، دواتر کە تەواو بوو وتی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە وابزانن لە ترسا نوێژەکەم درێژ دەکەمەوە زۆر نوێژەکەم درێژە پێدەدا. ئینجا نزای کرد لێیان و وتی: خوایە، هەموویان کۆکەرەوە و بە جارێ لەناویان بەرە و تاقیان مەهێڵە. ئینجا ئەم شیعرەی دەوتەوە:

هیچ باکم نییە وەک موسڵمانێک کاتێک دەکوژرێم

لەبەرخودایە، بەهەر جۆرێ بێ، با لەناو ببرێم

ئینجا لە خاچ درا و بەرزکرایەوە و بەسترایەوە بە دارخورمایەکەوە، (خبیب) وتی: خوایە، وا ئێمە پەیامی پێغەمبەرەکەتمان گەیاند، دەی تۆیش هەواڵی ئێمە بە پێغەمبەرەکەت بگەیەنە.

جا لەو کاتەی تیریان بۆ دەهاویشت پێیان دەوت حەزت ئەکرد ئێستا (محمد) لە شوێنی تۆدا بێت؟ ئەویش دەیوت: نە سوێند بە خوای گەورە، حەز ناکەم لە بری ئەم لەناوچوونەی من درکێکیش بچێت بە پێیدا، ئەوانیش پێدەکەنین.

**پەند و وانە:**

پێویستە پێغەمبەری خوامان(ﷺ) لە هەموو کەسێک خۆشتر بوێت، تەنانەت لە خۆمان و دایک و باوکیشمان. خۆشەویستی پێغەمبەریش(ﷺ) بە شوێنکەوتن و گوێڕایەڵی کردنی فەرمان و ڕێنماییەکانی دەبێت نەوەک بە دەم بڵێین خۆشمان دەوێت، کەچی بە کردار شوێنی نەکەوین.

کاتێک (خبیب) کوژرا دەموچاوی (خبیب)یان بە پێچەوانەی کەعبەوە وەرچەرخاند، کەچی دواتر تەماشایان کرد دەموچاوی ڕوو بە کەعبەیە، چەند جار وایان لێکرد کەچی هەر دەموچاوی ڕووی دەکردەوە بەرەو قیبلە، بۆیە وازیان لێهێنا.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە هەواڵی (خبیب)ی پێ گەیشت، هەریەک لە (مقداد) و (زبیر)ی نارد، تا تەرمی (خبیب) لە دارخورماکە دابگرن. ئەوانیش کە گەیشتنە ئەوێ هەرچۆنێک بێت تەرمەکەی (خبیب)یان داگرت، تەرمەکەشی هیچ تێک نەچووبوو، بەڵام بێباوەڕەکان پێیان زانین، کاتێک کەوتنە شوێنیان (زبیر) تەرمەکەی خستە خوارەوە، زەوی تەرمەکەی (خبیب)ی قووتدا و تەرمەکەی دیار نەما و نەکەوتە دەست بێباوەڕان.

**پرسیار:**

١- چەند کەس لەو دە کەسە بەدیل گیران؟
٢- بۆچی منداڵەکانی (حارث) (خبیب)یان کرِی؟
٣- داواکاری (خبیب) لە دوژمنەکانی چی بوو؟
٤- بۆچی (خبیب) نوێژەکەی درێژ نەکردەوە؟
٥- تەرمەکەی (خبیب) چی لێهات؟

## ٩- (زید بن حارثة)(رضي الله عنه)

ئەم هاوەڵە خۆشەویستەی پێغەمبەر(ﷺ) ناوی (زید بن حارثة)یە.

(زید) هێشتا بچووک بوو کە لەگەڵ دایکی چوو بۆ لای هۆزەکەی دایکی، لەو ماوەدا هێرش کرایە سەر ئەو هۆزە و تیایدا (زید) بەدیل گیرا و دواتر برا بۆ بازارێکی ناو (مكة) و لەوێ فرۆشرا. (حكيم بن حزام) (زید)ی کڕی بۆ (خديجة)ی پووری، بە چوارسەد درهەم ئەوی کڕی، ئیتر (زید) لای (خديجة) مایەوە، تا ئەوەی (خديجة) شووی کرد بە پێغەمبەر(ﷺ)، ئەوکات بەخشی بە پێغەمبەر(ﷺ).

دواتر (زید) کۆچی کرد بۆ (مدينة)، کاتێک (حارثة) هات بۆ (مدينة)و (زید)ی بینی، (زید) لەبەر ڕێزی پێغەمبەر(ﷺ) لەبەری هەڵنەسا. (حارثة) و هاوڕێکانی بانگی (زید)یان کرد، بەڵام ئەو وەڵامی نەدایەوە.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی (زید) ئەوانە کێن؟

وتی: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەیان باوکمە و ئەوەشیان ماممە و

ئەوەشیان برامە و ئەوەش هۆزەکەمن.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (دەی هەستە و سەلامیان لێ بکە) ئەوانیش سەلامیان لێکرد.

ئینجا وتیان: ئەی (زید) لەگەڵ ئێمە وەرەوە.

(زید) وتی: بەس لای پێغەمبەری خوام دەوێت و نایگۆڕمەوە بە کەس. ئەوانیش وتیان: ئەی (محمد) چەند پارەت دەوێت پێ دەدەین لەبری ئەم کۆیلەیە، تا بیدەیتەوە پێمان.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: داواتان لێ دەکەم شایەتی بدەن هیچ پەرستراوێک نییە جگە لە خوا و من کۆتای پێغەمبەرانی خوام، ئینجا دەینێرم لەگەڵ تان، بەڵام ئەوان بەوە ڕازی نەبوون. دواتر پێغەمبەر(ﷺ) ڕێی دا بیبەن، بەڵام (زید) ئامادە نەبوو لەگەڵیان بڕوات. (حارثة)ی باوکی وتی: من خۆم ئامادەم موسڵمان بم، ئەوەبوو شایەتومانی هێنا و ئەوانی تر ئامادە نەبوون موسڵمان بن.

(زید) دە ساڵ لە پێغەمبەر(ﷺ) بچووکتر بوو و باڵاشی کورت بوو، ڕەنگی سپی بوو.

پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاری دا ژن بهێنێت بۆ (زید)، بۆیە (أم أیمن)ی بۆ هێنا و لەم ژنەی (زید) کوڕێکی بوو بە ناوی (أسامة)، دواتر (زید) (زینب بنت جحش)ی بەهاوسەر گرت، ئەمیش پوورزای پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو، بەڵام دواتر (زید)

(زینب)ی تەڵاق دا، دوای ئەوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ژنێکی تری بۆ هێنا.

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) بانگەوازی ڕاگەیاند و بێباوەڕان کێشەیان بۆ دروست دەکرد، هاتن بۆ لای (أبو طالیب) و پێشنیازی ماددییان دەخستە بەردەم پێغەمبەر(ﷺ)، تا واز بهێنێت. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: تەنها یەک وشەم دەوێت لێتان بڵێن: لا اله الا الله، بەڵام ئەوان ڕازی نەبوون. یەکێکیان وتی: ئەمە تەنها چارەسەری بریتیە لە کوشتنی، بۆ شەوەکەی پێغەمبەر(ﷺ) دیار نەما. (أبو طالیب) و مامەکانی هاتن بۆ ماڵی، کەچی لەوێ نەبوو، بۆیە گەنجانیان کۆکردنەوە و هەرکام ئاسنێکیان بە دەستەوەبوو. (أبو طالیب) وتی: دەچمە لای کەعبە و هەرکامتان لای سەرکردەیەکیان بوەستن، ئەگەر (محمد) کوژرابوو دەیانکوژین. لەو کاتەدا (زید) هاتەوە، (أبو طالیب)ی بەو شڵەژاویە بینی.

(أبو طالیب) وتی: ئەی (زید) برازاکەمت نەدیوە؟

وتی: با کەمێک لەمەوبەر لەگەڵ من بوو.

(أبو طالیب) وتی: ناچمەوە ماڵ، تا نەیبینم. خێرا (زید) چوویە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە لە ماڵێک لەگەڵ هاوەڵانی بوو، هەواڵ و بەسەرهاتەکەی بۆ باسکرد، پێغەمبەریش(ﷺ) گەڕایەوە و هات بۆ لای (أبو طالیب).

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ (طائف) (زید)یش لەگەڵیدا چوو، کاتێک خەڵکی ئەوێ پێغەمبەریان(ﷺ) بەردباران دەکرد، (زید) خۆی دەدایە بەر بەردەکان و پێغەمبەری خوای(ﷺ) دەپاراست، ئینجا کە پێغەمبەر(ﷺ) بۆ حەسانەوە لە ژێر دارخورمایەکدا دانیشتبوو، (زید) پێی وت: چۆن دەچیتەوە ناو (مکة) لەکاتێکدا قورەیشیەکان تۆیان دەرکرد. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەی (زید) ئەم حاڵەی تۆ دەیبینیت خوای گەورە دەرووی خێر و ڕزگاری بۆ دەکاتەوە، خوا ئایینی خۆی سەردەخات و پێغەمبەرەکەی سەردەخات).

(زید) دواتر کۆچی کرد بۆ (مدینة)، لەوێ لە غەزای بەدر و ئوحود و غەزاکانی تریشدا بەشداری کرد، تا لە غەزای موئتەدا شەهید بوو.

پێغەمبەر(ﷺ) هەریەک لە (زید) و (أبو رافع)ی بانگ کرد و دوو وشتری پێدان و پێنج سەد درهەمیشی پێدان و ئەوانی نارد بۆ (مکة)، تا بچن (فاطمة) و (أم كلثم)ی کچانی پێغەمبەر(ﷺ) و (سودة) و (أسامة بن زید) بهێنن بۆ (مدینة).

کاتێک (زینب) کەوتەڕێ بۆ کۆچەکەی، خێرا کۆمەڵێکک کەوتنە شوێنی، تا ئازاری بدەن. ئەوکات (زینب) سکی هەبوو. (زینب)یان لەسەر وشترەکەی خستە خوارەوە و بەو

کەوتنەی سکەکەی خست و خوێنیشی لێ ڕۆیشت. ئەوەبوو (زینب) برایەوە بۆ لای (هند بنت عتبة)، (هند) پێی دەوت: هەموو ئەم بەزمانە لەبەر باوکتە. (زید) بە وشترەکەیەوە نزیک بوویەوە، تا گەیشت بە شوانێک، وتی: شوانی کێیت؟

ئەویش وتی: هی (أبو العاص)م.

وتی: ئەی ئەو مەڕانە هی کێن؟

وتی: هی (زینب بنت محمد)ن، (زید) لەگەڵیدا چوو. دواتر بە شوانەکەی وت: ئەگەر شتێکت بدەمێ دەیگەیەنیتە دەستی (زینب)، بەڵام لای کەس باسی نەکەیت؟ وتی: بەڵێ، (زید) خاتەمەکەی پێدا، کابرای شوانە چوویەوە و مەڕەکانی کردەوە شوێنی خۆیان و خاتەمەکەی دا بە (زینب)، (زینب)یش خاتەمەکەی ناسیەوە و وتی: کێ ئەمەی پێدایت؟

شوانەکە وتی کابرایەک. (زینب) وتی: ئەی لەکوێ جێتهیشت؟

وتی: لە فلانە شوێن. (زینب)یش بێدەنگ بوو، تا شەو هات. ئینجا چوو بۆ لای (زید) کە گەیشتە لای (زید)، (زید) وتی: (سەرکەوە لەپێش منەوە دابنیشە). (زینب) وتی: نەخێر، تۆ سەرکەوە و لەپێش منەوە دابنیشە، (زینب) لە دواوە و (زید) لە پێشیەوە بەسەر وشترەکەوە چوونەوە بەرەو (مدینة)

.پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: (ئەمە چاکترین کچمە کە لە بەر

من تووشی ناڕەحەتی بوو).

(زید) لە قورئاندا و لە سووڕەتی ئەحزابدا ناوی هاتووە، ئەمیش تاکە هاوەڵە کە لە قورئاندا ناوی هێنرابێت.

(زید) سیفەتی سەرکردایەتی و ئەمیرایەتی تێدابوو، پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی بەوە داوە.

(عائشة)ی دایکی باوەڕداران دەڵێت: جارێک (زید) هات و تەقەی دا لە دەرگا، پێغەمبەر(ﷺ) بەرەورووی هەستا و جلەکانی بەدوای خۆیدا رادەکێشا و باوەشی کرد بە (زید)دا و ماچی کرد.

پێغەمبەر(ﷺ) (زید)ی نارد بۆ شەڕی موئتە لە خاکی (شام)، ئەوەبوو لە مانگی جەمادیلئوولای ساڵی هەشتەمی کۆچیدا، لەو غەزایەدا شەهید بوو.

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی کوژرانی (جعفر) و (زید) و (عبدالله بن رواحة)ی بیست دانیشت و خەفەت دەموچاوی داگرتبوو. ئینجا دەیفەرموو: (خوایە، لە (زید) خۆش بیت، خوایە، لە (زید) خۆش بیت، خوایە، لە (زید) خۆش بیت، خوایە، لە (جعفر) خۆش بیت، لە (عبدالله بن رواحة) خۆش بیت).

پێغەمبەر(ﷺ) چوو سەردانی ماڵی (زید)ی کرد، کچەکەی (زید) هەنیسکی گریان گرتبووی و بە گریانەوە

ڕووەو پێغەمبەر(ﷺ) چوو، پێغەمبەریش(ﷺ) دەستی کرد بە گریان. (سعد بن عبادة) کە لەوێ بوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو گریانە چیە؟ فەرمووی: (ئەوە تاسەی خۆشەویستە بۆ خۆشەویستەکەی).

کاتێک (زید) شەهید بوو تەمەنی پەنجا و پێنج ساڵ بوو.

**پرسیار:**

١- (زید) چۆن گەیشتە (مکة)؟

٢- بۆچی (زید) لە (مدینة)وە گەڕایەوە بۆ (مکة)؟

٣- خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ (زید) باس بکە.

٤- پێغەمبەر(ﷺ) چ نزایەکی کرد بۆ (زید)؟

٥- سێ پەند و وانە لە ژیانی (زید)دا باس بکە.

## ١٠- (أبو عبيدة بن الجراح) (رضي الله عنه)

یەکێکی تر لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ناوی (عامر بن عبدالله)یە کە زیاتر بە (أبو عبيدة) ناسراوە، (أبو عبيدة) هەر زوو لە (مكة) موسڵمان بوو، هێشتا بانگەواز نهێنی بوو (أبو عبيدة) موسڵمان بوو.

(أبو عبيدة) یەکێکە لە بەشداربوانی کۆچی (حبشة)، دواتر لەوێوە گەڕایەوە (مكة) و لەوێوە کۆچی کرد بۆ (مدينة).

(أبو عبيدة) لە غەزای بەدر و ئوحود و خەندەق و هەموو غەزاکانی دواتریشدا بەشداری کرد.

لە غەزای بەدردا (أبو عبيدة) بەشدار بوو و بە بەرچاوانییەوە باوکی کە لە ناو سوپای بێباوەڕاندا بوو کوژرا.

(أبوبكر الصديق) دەڵێت: کە خەڵکی لە ئوحوددا لە دەوری پێغەمبەر(ﷺ) بڵاوەیان کردبوو، یەکەم کەس من بووم چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، دەبینم کەسێک لە دەوری بەرگری لێدەکات. وتم: بەڵکو ئەوە **(طلحة)** بێت بە دایک و باوکمەوە بە قوربانی بم، دواتر بینیم لە دوایشەوە کەسێک هات دەتوت

باڵندەیە و دەفڕێت، خێرا خۆی گەیاندە من، دەبینم (أبو عبیدة)یە، خێرا پێکەوە چووین بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و (**طلحة**)ش لە بەردەم پێغەمبەردا(ﷺ) کەوتبوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: فریای براکەتان بکەون، ئینجا تیرێک بەر تەوێڵی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و تیرێکیش بەر روومەتی کەوتبوو. (أبو عبیدة) وتی: ئەی (أبوبکر) سوێندت دەدەم بە خوا بهێڵە من لایبەرم، ئەوەبوو بە ددان تیرەکەی گرت و هێواش هێواش دەریدەکرد و حەزی نەدەکرد پێغەمبەر(ﷺ) ئازاری پێ بگات، دواتر ویستم من تیرەکەی تر دەربکەم، کەچی هەمدی (أبو عبیدة) سوێندی دام و بەهەمان شێوە ئەوی دیکەشی دەرکرد.

جارێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) سوپایەکی ئامادە کرد کەژمارەی جەنگاوەرەکانی زیاد لە سێ سەد کەس دەبوون، (أبو عبیدة)شی کرد بە ئەمیری سوپاکە، پێغەمبەر(ﷺ) بڕێک خورمای پێدابوون کە لە بەر کەمیەکەی وەک منداڵ خورماکەیان دەمژی و بە دوایدا ئاویان دەخواردەوە، ئینجا ئەو گەڵایانەی کەوەریبوون دەیانخوارد و بەدوایدا ئاویان دەخواردەوە، ئینجا گەیشتینە کەناراوی دەریا، دەبینین حووتێکی گەورە لەوێدا کەوتووە، (أبو عبیدة) وتی: ئەوە مردارەوە بووە مەیخۆن، دواتر وتی: ئەمە سوپای پێغەمبەری خوایە، و لە ڕێی خوادایە و

ئێمەش ناچارین، ناوی خوا بهێنن و لێی بخۆن، لێیان خوارد و بەشێکیشیان لێهەڵگرت، (أبو عبيدة) پارچەیەکی لێهەڵگرت کەهاتنەوە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و هەواڵی پرسین، ئەوانیش بەسەرهاتەکەیان بۆ باسکرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەوە رۆزیەک بوو خوا پێی بەخشین، هیچیتان لێ هێناوەتەوە؟) وتیان: بەڵێ، بڕێکیان لێی برد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش لێی خوارد.

هەروەها (أبو عبيدة) لە فەتحی (مكة)شدا بەشداری کرد.

هەروەها کاتێک (عمرو بن العاص) هێرشی بردە سەر سنوورەکانی (شام)، (عمرو) داوای ناردنی سوپای پشتیوانی لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد، پێغەمبەریش(ﷺ) سوپایەکی لە کۆچەران پێکهێنا و (أبو عبيدة)ی کرد بە بەرپرسیان.

(أبو عبيدة)، تا دواساتەکانی ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) بەشداری غەزاکانی دەکرد و هەموو هەوڵێکی دەدا بۆ خزمەتکردنی ئیسلام.

پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: (ئەمینداری ئەم ئوممەتە (أبو عبيدة بن الجراح)ە، هەروەها دەیفەرموو: (هەر ئوممەتێک ئەمینێکی هەیەو ئەمینی ئەم ئوممەتەش (أبو عبيدة بن الجراح)ە.

کاتێک وەفدی (یمن) هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، داوایان

کرد کەسێک بنێرێت لەگەڵیان، تا فێری سوننەت و ئیسلامیان بکات. پێغەمبەریش(ﷺ) دەستی (أبو عبیدة)ی گرت و فەرمووی: (ئەمە ئەمینی ئەم ئوممەتەیە).

(أبو عبیدة) یەکێکە لە موژدەپێدراوانی بەهەشت. پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو ((أبو عبیدة بن الجراح) لە بەهەشتە).

(عمرو بن العاص) دەڵێت: پرسیار کرا لە پێغەمبەر(ﷺ) کێ زۆر لات خۆشەویستە؟

فەرمووی: (عائشة).

وتیان: ئەی لەپیاوان؟

فەرمووی: (أبوبکر).

وتیان: دواتر.

فەرمووی: (عمر).

وتیان: دواتر.

فەرمووی: (أبو عبیدة بن الجراح).

لە سەردەمی خیلافەتی (أبوبکر الصدیق)دا (أبو عبیدة) یەکێک بوو لە بەشداربوانی کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز، هەروەها (أبوبکر) (أبو عبیدة)ی کردبوو بە بەرپرسی دارایی موسڵمانان، دواتر (أبو عبیدة)ی نارد بۆ (شام) و کردی بە ئەمیری ئەوێ.

(عمر بن الخطاب)یش لەگەڵ دەستبەکاربوونیدا خێرا بەرپرسیارێتی گەورەی بە (أبو عبیدة) سپارد. (أبو عبیدة) لە ماوەی ئەمیرایەتیەکەیدا توانی زۆر ناوچە بخاتە ژێر دەسەڵاتی ئیسلامەوە و خەڵکێکی زۆریش موسڵمان بوون.

(عمر بن الخطاب)زۆر سەرسام بوو بە (أبو عبیدة)، دەیوت: ئەگەر سەرەمەرگم هات و (أبو عبیدة) زیندوو بێت، دەیکەم بە جێنشینی خۆم.

جارێک (عمر) لەگەڵ هەندێ لە هاوەڵانیدا بوو، وتی هەرکامتان هیوا و ئاواتی خۆتان بڵێن، هەرکەسەو هیوا و ئاواتی خۆی وت. (عمر)یش وتی: من خۆزگە دەخوازم پڕیماڵێک پیاوی وەک (أبو عبیدة بن الجراح)م هەبێت.

جارێک (عمر) گەیشت بە (أبو عبیدة)، پێکەوە تەوقەیان کرد و (عمر) دەستی (أبو عبیدة)ی ماچکرد.

جارێک (عمر بن الخطاب)بۆ سەردان چوو بۆ (شام)، لەوێ خەڵکی پێشوازیەکی گەرمیان لێکرد، (عمر) وتی: (أبو عبیدة)ی برام کوا؟ وتیان: ئێستا دێت. پاش کەمێک بە سواری وشترێکەوە هات، دواتر لەگەڵ خۆی خەلیفەی بردەوە بۆ ماڵەوە. (عمر) تەماشای کرد لە ماڵەکەیدا تەنها شمشێر و کەوان و کۆڵەکەی لەوێن. (عمر) وتی: بۆچی شتێکی وات لە ماڵەوە دانەناوە؟

ئەویش وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەمە دەمانگەیەنێتە جێ، دواتر داوای خواردنی کرد، ئەویش چوو چەند پارچە نانێکی رەقی هێنا. (عمر) دەستی کرد بە گریان، پاشان وتی: ئەی (أبو عبیدة) دنیا هەموومانی گۆڕی تەنها تۆ نەبێت.

پەند و وانە:

دەبێت سەرکردەی وڵات و بەرپرسی ناوچەکان زۆر سەرقاڵی دنیا و پارە و سامان نەبن و زیاتر بیریان لای هاوڵاتیانی ناوچەکە بێت، دەبێت بە جۆرێک بژین لە سەختی و نارەحەتی ژیان خەڵک تێبگەن، ئەگەرنا لای خوا بەرپرسیار دەبن و سزایان سەخت دەبێت.

(أبو عبیدة) بەوە ناسرابوو کە ڕەوشتی زۆر جوان بووە و زۆر لەسەرخۆ و نەرمونیان بووە، کەسێکی تەواو خاکی بووە.

دواجار (أبو عبیدة) لە (شام) و لە ساڵی هەژدەی کۆچی و لە تەمەنی پەنجاو هەشت ساڵیدا بە نەخۆشی تاعوون کۆچی دوایی کرد.

(أبو عبیدة) دەیوت: لەوانەیە کەسی وا هەبێت جلەکەی پاک و سپی بێت، کەچی دینداریەکەی پیس بێت. هەروەها دەیوت: ئەگەر خوا بەرەکەت بخاتە شتی کەمەوە، ئیتر ئەو شتە زۆر ئەبێت.

پرسیار:

١- (أبو عبيدة) لە غەزای ئوحوددا چی کرد؟

٢- پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بە (أبو عبيدة) چی فەرموو؟

٣- بەسەرهاتی سەردانەکەی پێشەوا (عمر) بۆ لای (أبو عبيدة) چۆن بوو؟

٤- ئەرک و ئیشەکانی (أبو عبيدة) لەسەردەمی خەلیفە (أبوبکر)دا چی بوون؟

٥- دوو وتەی جوانی (أبو عبيدة) باس بکە.

# ١١- (عباس)ی مامی پێغەمبەر (ﷺ)

یەکێک لە مامەکانی پێغەمبەر(ﷺ) کە موسڵمان بوو و بە موسڵمانی کۆچی دوایی کرد، ناوی (عباس) بوو. پێغەمبەر(ﷺ) زۆر خۆشی دەویست و ڕێزێکی زۆری دەگرت. (عباس) دوو ساڵ پێش لە دایکبوونی پێغەمبەر (ﷺ) لە دایکبوو. (عباس) باوکی یەکێک لە هاوەڵ و زانا گەورەکانی ناو مێژووی موسڵمانانە کە ئەویش (عبدالله بن عباس)ە.

(عباس)ی مامی پێغەمبەر(ﷺ) لە سەردەمی نەفامیدا لە (مكة) گەورەی قوڕەیش بوو، سەرپەرشتی مەسجیدولحەرام بەدەست ئەو بوو، زۆر بە جوانی بارەکەی ڕادەگرت، نەیدەهێشت تاکە کەسێک لە مەسجیدولحەرامدا قسە بکات.

(عباس) دەڵێت: جارێک لە مزگەوت بووم کە (أبو جهل) هات و وتی: سوێند بێت، ئەگەر (محمد) ببینم لە سوجدەدا بێت بچمە سەر گەردنی. منیش چووم و هەواڵم دا بە پێغەمبەر(ﷺ). پێغەمبەریش(ﷺ) بە توورەییەوە چوویە مزگەوت و دەستی کرد بە قورئان خوێندن، کەسێک بە (أبو

جهل)ی وت: ئەوە (محمد)ە. ئەویش وتی: مەگەر ئەوەی من دەیبینم ئێوەش نایبینن؟ بەخوا ئاسمان بەسەرمەوە وەستاوە.

(عباس) هاودەم و کەسی نزیکی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، زۆر جار لە (مکة) پێکەوە دادەنیشتن و پێکەوە دەچوونە بازاڕ و پێشوازی میوان و وەفدی ناوچەکانیان دەکرد.

(عباس) هەر زوو لە (مکة) موسڵمان بوو، بەڵام بە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) موسڵمانبوونی خۆی شاردەوە و لە (مکة) مایەوە، تا هەم سەرپەرشتی موسڵمانانی ئەوێ بکات و هەم هەواڵی بێباوەڕان بنێرێت بۆ پێغەمبەر(ﷺ). (عباس) کاتێک ویستی کۆچ بکات بۆ مەدینە پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: (مانەوەت لە (مکة) چاکترە).

(أبو رافع)ی خزمەتکاری (عباس) دەڵێت: من خزمەتکاری (عباس) بووم و موسڵمان بووبووم، خودی (عباس) و ژنەکەشی موسڵمان بووبوون، بەڵام (عباس) موسڵمانبوونەکەی خۆی دەشاردەوە.

(عباس) بە ناچاری و بە نابەدڵی لە جەنگی بەدردا لەگەڵ بێباوەڕاندا بەشداری کرد و تیایدا بە دیل گیرا، پێش ئەوەی جەنگی بەدر ڕووبدات. پێغەمبەر(ﷺ) بە هاوەڵانی فەرموو: هەرکەس (عباس)ی بینی نەیکوژێت، چونکە بە نابەدڵی هاتووە.

ئەو شەوەی (عباس) دیل بوو، پێغەمبەر(ﷺ) نەخەوت.

هاوەڵان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆچی ناخەویت؟

فەرمووی: نرکە و ناڵەی (عباس)ی مامم بیست کە کۆتکراوە. ئەوانیش چوون کۆتەکەیان لابرد، ئیتر (عباس) بێدەنگ بوو، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) خەوت.

دواتر پێغەمبەر(ﷺ) بە (عباس)ی فەرموو: ئەی (عباس) خۆت و (عقیل)ی برازات و (نوفل) و (عتبة) بە سامان ئازاد بکە، چونکە تۆ سامانت هەیە. ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) من موسڵمان بووم، بەڵام هۆزەکەم بە زۆر منیان هێنا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خوا زاناترە بە موسڵمان بوونت، ئەگەر وابێت کەدەیڵێیت ئەوە خوا پاداشتت دەداتەوە، ئەویش وایکرد.

کاتێک بێباوەڕان خۆیان ئامادە کرد بۆ جەنگی ئوحود، (عباس) وردەکاری زانیاری بێباوەڕانی بە نامەیەک نووسی بۆ پێغەمبەر(ﷺ).

ماوەیەک پێش فەتحی (مکة)، (عباس) بە ژن و منداڵیەوە کەوتەڕێ بۆ (مدینة)، بەڵام لە نیوەی ڕێدا گەیشت بە پێغەمبەر(ﷺ) کە دەچوو بۆ فەتحی (مکة).

لە شەوی فەتحی (مکة)دا (عباس) بە (أبوسفیان)ی وت: ماڵوێران سەرکەوە، با بتبەم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و داوای

پەنات بۆ بکەم. (أبوسفیان)یش لە دوای (عباس)ەوە سەرکەوت، (أبوسفیان)ی برد و لای پێغەمبەر(ﷺ) تکای بۆ کرد، ئینجا بەو هۆیەوە (أبوسفیان) موسڵمان بوو.

(عباس) پاش فەتحی (مکة) لە نزیکی پێغەمبەرەوە(ﷺ) بوو. پێغەمبەری خوا(ﷺ) زۆر ڕێزی لە (عباس) دەنا و سەردانی دەکرد. (عباس) لە غەزای حونەیندا بەشداری کرد و ئەو کاتەی موسڵمانان شکان و بڵاوەیان کرد لە دەوری پێغەمبەر(ﷺ)، (عباس) یەکێک بوو لەوانەی لە دەوری پێغەمبەر(ﷺ) مایەوەو بەرگری لێدەکرد.

جارێک (عباس) بەوپەڕی تووڕەییەوە چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: چی تووڕەی کردویت؟

(عباس) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) قورەیش چیانە؟ کە بە یەکتر دەگەن بەیەکەوە ڕوویان خۆشە، کەچی کە بە ئێمە دەگەن دەموچاویان جۆرێکی ترە. پێغەمبەر(ﷺ) تووڕە بوو، تا ئەوەی دەموچاوی سوور هەڵگەڕا و دواتر فەرمووی: (سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئیمان ناچێتە دڵی کەسێکەوە، تا ئێوەی لەبەر خوا و پێغەمبەرەکەی خۆش نەوێت). پاشان فەرمووی: (ئەی خەڵکینە هەرکەس ئازاری مامم بدات ئەوە ئازاری منی داوە، چونکە مامی هەر کەسێک هاوتای

باوکیەتی).

(عباس) یەکێک بوو لەوانەی کە تەرمی پێغەمبەری خوای(ﷺ) شۆرد، دواتریش پێش هەموان نوێژی لەسەر تەرمەکەی کرد کە تەرمەکەشی خرایە ناو گۆڕەکەی، (عباس) یەکێک بوو لەوانەی دابەزیە ناو گۆڕەکەی.

کاتێک (عمر بن الخطاب)بوو بە خەلیفە و مووچەی بۆ خەڵکی بڕیەوە، بۆ (عباس)ی مامی پێغەمبەر(ﷺ) پێنج هەزار درهەمی دیاری کرد، چونکە مامی پێغەمبەر(ﷺ) بوو.

هاوەڵان پلەوپایەی (عباس)یان دەزانی و ڕێزێکی زۆریان لێدەگرت و ڕاوێژیان پێدەکرد.

(عباس) لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا تووشی نەخۆشی بوو و دواجار لە سەردەمی خیلافەتی **(عثمان بن عفان)** و لە ڕۆژی هەینی و لە (مدینة) کۆچی دوایی کرد و **(عثمان بن عفان)** نوێژی لەسەر کرد و لە گۆڕستانی بەقیع ئەسپەردە کرا، تەمەنی هەشتا و هەشت ساڵان بوو.

(عباس) تا کاتی وەفاتی نزیکەی حەفتا کۆیلەی ئازاد کرد، چونکە کەسێکی بازرگان بوو، دەوڵەمەند بوو و خێری زۆری دەکرد.

(عباس) دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: (ئەوە چێژی ئیمانە، کەسێک ڕازی بێت خوا پەروەردگاری بێت و

ئیسلام ئایینی بێت و (محمد) پێغەمبەری بێت).

**پرسیار:**

١- بۆچی (عباس) لە (مكة) مایەوە و كۆچی نەكرد بۆ (مدینة)؟

٢- (عباس) لە بەدردا چی بەسەرهات؟

٣- (عباس) چۆن یارمەتی (أبوسفیان)ی دا؟

٤- بۆچی (عباس) توورە بوو؟

٥- فەرموودەیەك بخوێنەرەوە كە(عباس) گێڕاویەتیەوە.

٦- گرنگترین پەند و وانەكانی نێو ژیانی (عباس) چی بوون؟

## ١٢-(عبدالله بن مسعود)(رضي الله عنه)

ئەم هاوەڵەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) یەکێکە لە زانا و کەسە دیارەکانی ناو هاوەڵان، یەکێک لەو هاوەڵانەی کە لە (مدینة)دا خەڵکی وانەیان لەلا دەخوێند و زانایەکی گەورە و دیار بوو، فەرموودەیەکی زۆری لە پێغەمبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) گێڕاوەتەوە، ئەویش ناوی (عبدالله بن مسعود)ە.

(عبدالله بن مسعود) کەسێکی لاوازی باڵا کورت بوو، جلی سپی دەپۆشی و هەمیشە بۆنی خۆشی لە خۆی دەدا، لە ناو کتێبەکاندا زیاتر بە (إبن مسعود)ناسراوە.

(إبن مسعود) یەکێکە لە دەستەی یەکەمی موسڵمانبووان بوو. موسڵمان بوونەکەشی بەو جۆرە بوو کە خۆی دەیگێڕێتەوە و دەڵێت: من مەڕوماڵاتی (عقبة)م دەلەوەڕاند. پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دای بە لامدا و منیش منداڵ بووم، فەرمووی: ئەی مێرمنداڵ شیر هەیە؟

وتم: بەڵێ، بەڵام من ڕاسپاردەم و هی خۆم نییە.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی مەڕێک هەیە بەران نەچووبێتە لای؟

وتم: بەڵێ. چووم و هێنام.

پێغەمبەر(ﷺ) دۆشی و شیر هات و شیرەکەی کردە قاپێک و لێی خواردەوە و بەشی (أبوبکر)یشی دا، دواتر بە گوانەکەی فەرموو بوەستە، ئەوەبوو لە شیردان وەستا. منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو قسەم فێر بکە، ئەویش دەستی هێنا بەسەرمدا و نزای بۆ کردم و فەرمووی: (خوا ڕەحمت پێ بکات، تۆ مێرد منداڵێکی فێرکراویت).

(إبن مسعود)یەکەم کەس بوو دوای پێغەمبەر(ﷺ) بە ئاشکرا لە (مكة) قورئانی خوێند، ڕۆژێک هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) وتیان: بەخوا قورەیش گوێیان لەم قورئانە نەبووە بە ئاشکرا بۆیان بخوێنرێت، جا کێ ئەوە دەکات؟ (عبدالله بن مسعود) وتی: من.

وتیان: دەبێت کەسێک بێت هۆزەکەی بەرگری لێ بکەن.

وتی وازم لێ بهێنن، چونکە خوا دەمپارێزێت. ئەوەبوو (عبدالله) چوو و لە نێو قوڕەیشیەکاندا دەستی کرد بە قورئان خوێندن، ئەوانیش ڕامابوون و دەیانوت ئەمە چی دەڵێت، خەڵکێک وتیان: ئەوە دەخوێنێت کە (محمد) هێناویەتی، بۆیە هەستان و کەوتنە لێدانی دەموچاوی و ئەویش هەر قورئانی دەخوێند، دواتر وازیان

لێهێنا و دەموچاوی تەواو خوێناوی بووبوو، هاوەڵانی چوون بۆ لای و وتیان: دەترساین ئەمەت تووش ببێت، ئەویش وتی بەخوا بتانەوێت بەیانیش هەمدی دێم و لێرە قورئانیان لەنێودا دەخوێنمەوە، ئەوانیش وتیان: نا بەسە، ئەوەی ڕقیان لێی بوو چپاندت بە گوێیاندا.

**پەند و وانە:**

پێویستە هەمووان وەک (إبن مسعود)ئامادە بین پەیامی خوا بگەیەنین و ترسمان لە دوژمن نەبێت، لەوە نەترسین سەرکۆنە بکرێین و بەرگەی ئازار و ناڕەحەتیەکانیش بگرین، چونکە گەیاندنی ڕاستی و حەق ئەرکی سەرشانی موسڵمانە.

(إبن مسعود)یەکێک بوو لەو هاوەڵانەی کۆچیان کرد بۆ (حبشة)، بەڵام ماوەیەک لەوێ مایەوە و دواتر گەڕایەوە بۆ (مكة)و لەوێشەوە کۆچی کرد بۆ (مدينة).

(إبن مسعود)یەکێک بوو لە بەشداربوانی غەزای بەدر، هەروەها لە غەزای ئوحودیشدا بەشداری کرد و تیایدا ڕۆڵی کارای بینی، بەتایبەت کاتێک موسڵمانان لە دەوری پێغەمبەر(ﷺ) بڵاوەیان کرد، (إبن مسعود)یەکێک بوو لەوانەی لە دەوری پێغەمبەر(ﷺ) مایەوە.

هەروەها (إبن مسعود)لە غەزای خەندەق و بەیعەتی ریزوان و

هەموو غەزاکانی دواتریشدا بەشداری کرد.

(أبو موسى الأشعري) دەڵێت: من و براکەم لە (يمن)ەوە هاتینە (مدينة)، ماوەیەک ماینەوە، (إبن مسعود) و دایکیشی هێندە سەردانی ماڵی پێغەمبەری خوایان(ﷺ) دەکرد وامانئەزانی لە بنەماڵەی پێغەمبەری خوان(ﷺ).

(إبن مسعود) لە کاتی سەفەر و دەرچوونەکانی پێغەمبەریشدا(ﷺ) هاودەمی پێغەمبەر(ﷺ) بوو و خزمەتی دەکرد، نەعلەکانی پێغەمبەری خوای(ﷺ) هەڵدەگرت و دەیخستە بنباڵی، داردەستەکەی دەدایە دەستی.

(إبن مسعود)هێندە هاودەمی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو کە دەیوت سوێند بەو خوایەی هیچ پەرستراوێک نییە جگە لەو چی سوورەتی قورئان دابەزیوە دەزانم لەکوێ دابەزیوە، چی ئایەتی قورئان دابەزیوە دەزانم لەسەر چی دابەزیوە، ئەگەر بزانم کەسێک لە خۆم شارەزاتر بە قورئان هەیە و دەتوانم بە سواری وشتر پێی بگەم دەچووم بۆ لای.

(إبن مسعود)هێندە شارەزا بوو لە خوێندنەوەی قورئاندا کە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: هەرکەس حەز دەکات بە جوانی قورئان بخوێنێتەوە، با بە شێوە خوێندنەوەی (إبن أم عبد)-واتە: (إبن مسعود)-بیخوێنێتەوە).

(إبن مسعود)دەڵێت: جارێک پێغەمبەر(ﷺ) بە منی فەرموو: قورئانم بەسەردا بخوێنەرەوە، منیش وتم: قورئانت

بەسەردا بخوێنمەوە لەکاتێکدا بۆ سەر تۆ دابەزیوە؟!

فەرمووی: حەز دەکەم لە کەسی جگە لە خۆم بیبیستم، منیش سورەتی نیسائم بۆ خوێندەوە ... بینیم چاوەکانی پێغەمبەر(ﷺ) فرمێسکیان پێوەیە.

جارێک پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە (إبن مسعود)، تا بچێتە سەر دارێک، تا شتێکی لێ داگرێت، ئەویش کە سەرکەوت، هاوەڵان تەماشای قاچی (إبن مسعود)یان دەکرد و بە باریکی قاچەکانی پێدەکەنین، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (بەچی پێدەکەنن؟ دڵنیابن قاچی (عبدالله) لە ڕۆژی دواییدا لە تەرازوودا زۆر قورسترە لە ئوحود).

(إبن مسعود)لە سەردەمی (أبوبكر الصديق)یشدا ڕۆڵی خۆی بینی و شەوانە پاسەوانی گەڕەکەکانی (مدينة)ی دەکرد، هەروەها لە جەنگی یەرمووکدا بەشداری کرد.

جارێک (إبن مسعود)هات بۆ لای (عمر بن الخطاب)و خەڵکی لە دەوری کۆبوونەوە، (عمر)یش پێکەنی و دواتر لەگەڵ (إبن مسعود)کەوتە قسەکردن و بە بینینی (إبن مسعود) دەموچاوی گەشابوویەوە و زەردەخەنەی بۆ دەکرد، دواتر کە (إبن مسعود)چوو (عمر) هەر تەماشای دەکرد و دەیوت کووپێکی پڕ لە زانستە.

(إبن مسعود) لە سەردەمی **(عثمان بن عفان)**دا بەرپرسی بەیتولمالی موسڵمانان بوو لە (الكوفة). بەیتولمالیش ئەو شوێنە

بوو کە سامانی گشتی موسڵمانانی تێدا بوو.

پاش ماوەیەک (إبن مسعود)گەڕایەوە بۆ (مدینة)و لەوێ نەخۆش کەوت. (عثمان بن عفان) سەردانی کرد. ئەوەبوو لە ساڵی سی و دووی کۆچیدا وەفاتی کرد، نوێژی لەسەر کرا، ئینجا وەستان تا شەو، چونکە خۆی وەسیەتی کردبوو شەو ئەسپەردەی بکەن، ئینجا لە گۆڕستانی بەقیع ئەسپەردەیان کرد.

(إبن مسعود)دەیوت: زۆر ڕقمە کەسێک ببینم دەست بەتاڵ بێت، نە خەریکی کاری دنیای بێت و نە خەریکی قیامەتی بێت.

هەروەها دەیوت ڕازی بە بەوەی خوا بۆی داناویت دەوڵەمەندترین کەس دەبیت.

**پرسیار:**

١- بەسەرهاتی قورئان خوێندنەکەی (إبن مسعود)لە (مكة) چۆن بوو؟

٢- (إبن مسعود)چۆن خزمەتی پێغەمبەری خوای(ﷺ) دەکرد؟

٣- لەو کاتەی (إبن مسعود)لەسەر دارەکە بوو، پێغەمبەر(ﷺ) چی فەرمووی؟

٤- سەردانەکەی (إبن مسعود)بۆ لای (عمر بن الخطاب)باس بکە.

٥- دوو ئامۆژگاری (إبن مسعود)بنووسەرەوە.

## ١٣- (أسلم)

لە سەردەمی زوودا وا باو بوو کاتێک جەنگیان دەکرد ژن و منداڵی ئەو شوێنەیان دەبرد کە هێرشیان دەکردە سەر، ئیتر ئەو منداڵانە وەک کۆیلە دەفرۆشران، تا خزمەتی ئەو کەسە بکەن کە دەیانکڕێت.

یەکێک لەو منداڵانە ناوی (أسلم) بوو کە لە بنەڕەتدا لە قیبطیەکانی میصر بوو، بەڵام کرا بە کۆیلە و هێنرا بۆ (مکة) و لەوێ لە بازاڕی کۆیلە فرۆشاندا فرۆشرا، دواتر ئەم کۆیلەیە موسڵمان بوو. (أسلم) زیاتر بە (أبو رافع) ناسرابوو.

(عباس)ی مامی پێغەمبەر(ﷺ) (أسلم)ی کڕی. ئەو کاتەی خزمەتی (عباس)ی دەکرد هەم (أسلم) و هەم (عباس) و هەم ژنەکەی (عباس)یش موسڵمان بووبوون، بەڵام (عباس) موسڵمانبوونی خۆی دەشاردەوە و نەیدەهێشت کەس پێی بزانێت.

(أسلم) هەر لە (مکة) مایەوە و کاتێک موسڵمانان کۆچیان

دەکرد بۆ (مدینة)، (أسلم) نەیدەتوانی بڕوات، چونکە هێشتا کۆیلەی (عباس) بوو.

(أسلم) بە دەست بێباوەڕانەوە ئازار دەدرا و لێی دەدرا، ئەوەتا خۆی بەسەرهاتێکمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێت:

کاتێک جەنگی بەدر ڕوویدا، من لە (مکة) بووم. کەسێکی لاواز بووم و سەرقاڵی ئیش بووم کە هەواڵی سەرکەوتنی موسڵمانان هات دڵخۆش بووین. (أبولهب)یش نەچووبوو بۆ جەنگەکە و لەبری خۆیدا (عاص بن هشام)ی ناردبوو، من لای ئاوی زەمزەم لەگەڵ ژنەکەی (عباس) بووم. (أبو جهل) هات و قاچی ڕاکێشا و پشتی تێکردم و دانیشت، ئەوەندەم بیست وتیان: ئەوە (أبوسفیان) هاتەوە، (أبولهب) چوو بۆ لای (أبوسفیان) و خەڵکی لە دەوری وەستابوون. پرسیاری کرد لە (أبوسفیان)، (أبوسفیان)یش هەواڵی پێدا کە شکستیان خواردووە، باسی لەوەش کرد پیاوانێکی جل و بەرگ سپی لە ئاسمانەوە هاوکاری موسڵمانانیان کردووە. منیش وتم: بەخوا ئەوانە فریشتەی خوا بوون، (أبولهب)یش، تا توانی دای بەناو دەمما، هات بۆم و کەوتە لێدانم، منیش کەسێکی لاواز بووم. ژنەکەی (عباس)یش بەرگری لێکردم و هەستا و دارێکی هەڵگرت و دای بە سەریدا و پێی وت: چۆن لە کۆیلەی (عباس) دەدەیت لە کاتێکدا (عباس) خۆی لێرە نییە. (أبولهب)یش بە سەرشۆڕییەوە

ڕۆشیت، سوێند بەخوا حەوت شەوی بەسەردا نەچوو، تا خوا تووشی نەخۆشیەکی کرد و بەهۆیەوە مرد. تەنانەت دوو کوڕەکەشی دوو سێ شەو تەرمەکەیان لە ماڵەوە جێهێشت و ئەسپەردەیان نەدەکرد، تا بۆنی کرد، خەڵکێک لە قوڕەیش پێیان وتن: ئەرێ شەرم ناکەن ناچن باوکتان ئەسپەردە بکەن لەکاتێکدا وا لە ماڵەوە بۆنی کردووە؟

وتیان: دەترسین ئێمەش تووشی نەخۆشیەکەی ئەو بین.

یەکێک وتی: وەرن منیش دێم لەگەڵتاندا. بەو حاڵەشەوە دەستیان بەری نەکەوت، بەڵکو هەر لە دوورەوە ئاویان کرد بە سەریدا، دوایی بردیان لە سەرووی (مكة)وە ئەسپەردەیان کرد و بەردیان لەسەری دانا.

**پەند و وانە:**

هەرکەس دژایەتی خوا و پێغەمبەرەکەی و موسڵمانان بکات، هەر لە دنیادا سەرشۆڕی بۆ دەمێنێتەوە، جگە لەوەی لە ڕۆژی دواییدا سزای دۆزەخی بۆ ئامادەیە. بڕوانە (أبولهب) کە دژایەتی پێغەمبەری خوای(ﷺ) دەکرد تووشی چ ڕسواییەک بوو و وای لێهات منداڵەکانی ئامادە نەبوون تەرمەکەشی بخەنە ناو گۆڕەوە.

کاتێک (عباس) لە غەزای بەدردا بە دەستی موسڵمانان بە دیل گیرا، (أسلم) چوو پارەی برد و (عباس)ی ئازاد کرد.

پرسیار: خۆ (عباس) موسڵمان بووبوو، ئیتر بۆچی بە دەستی موسڵمانان بە دیل گیرا؟

وەڵام: چونکە (عباس) موسڵمانبوونەکەی خۆی شاردبوویەوە، تا کەس پێی نەزانێت و بتوانێت لە (مكة) هەواڵی بێباوەڕان بنێرێت بۆ پێغەمبەر(ﷺ).

(عباس) لە تاو خۆشەویستی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) (أسلم)ی پێ بەخشی، پێغەمبەریش(ﷺ) خێرا ئەوی ئازاد کرد و نەیهێشت بە کۆیلەیی بمێنێتەوە، هەر ئەوەش نا، بەڵکو ژنێکیشی بۆ هێنا بە ناوی (سلمى).

(أسلم) کۆچی کرد بۆ (مدينة) و دواتر لەگەڵ (زيد) و (طلحة)دا چوون، تا ژن و منداڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) و (أبوبكر) ببەن بۆ (مدينة).

**پەند و وانە:**

دەبێت چەندە بتوانین نارەحەتی سەر شانی دەوروبەرمان لاببەین و هەوڵ بدەین لەبری ئازاردان، یان ئەرک دروست کردن بۆیان، ببینە پشتیوان و هاوکاریان، وەک چۆن پێغەمبەر(ﷺ) (أسلم)ی لە کۆیلەیی ڕزگار کرد و هاوکاریشی کرد، تا ژن بهێنێت.

(أسلم) چەند کوڕێکی هەبوو کە فەرموودەیان لە باوکیانەوە دەبیست و لەبەریان دەکرد و دواتر دەیانگێڕایەوە بۆ موسڵمانان.

(أسلم) بەشداری غەزای ئوحود و خەندەق و غەزاکانی دواتریشی کرد، لە غەزای خەیبەردا هەم خۆی و هەم (سلمی)ی ژنیشی بەشداری غەزاکەی کرد، ئامادەیی ئەوەی هەبوو ماڵ و گیانی لە پێناوی ئیسلامدا بەخت بکات.

(أسلم) دەڵێت شەوێک سەرمایەکی سەخت بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد هەرکەس لێفە و شتی پێیە بیدات بەسەر ئەوەشدا کە نییەتی، من کەسم شک نەبرد هاوبەشیم بکات، بۆیە چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش لێفەکەی خۆی دا بەسەر منیشدا، پێکەوە خەوتین تا بەیانی. بەیانی کە هەستاین مارێک لای قاچیەوە بوو، فەرمووی: ئەی (أبورافع) بیکوژە بیکوژە.

**پەند و وانە:**

دەبێت هەمیشە لە تەنگانە و ناڕەحەتیەکاندا بیرمان لە دەوروبەرمان بێت و تەنها خەیاڵمان لای خۆمان نەبێت، چونکە موسڵمان دەبێت چی بۆ خۆی پێ خۆش بوو، بۆ برا موسڵمانەکەشی پێی خۆش بێت.

پێغەمبەر(ﷺ) جارجارە دەچوو بۆ گۆڕستانی بەقیع و نزای

خێــری دەکــرد بــۆ مردوانــی موســڵمانان، لەگەڵ خۆیشــیدا (أبورافــع)ی دەبــرد، لەوێــیش پێغەمــبەر(ﷺ) فەرمــوودەی بــۆ (أبورافع) دەفەرموو و ئەویش لەبەری دەکرد و دواتر دەیگێڕایەوە بۆ موسڵمانان، تا سوودی لێ وەربگرن.

(أبورافــع) دوای وەفــاتی پێغەمــبەری خــوایش(ﷺ) ژیــا و بەشــداری جیهــاد و غەزاکــانی دەکــرد، دەچــوو بــۆ مــزگەوت نوێژەکانی دەکرد و فەرموودەی بۆ موسڵمانان دەگێڕایەوە و تا ئەو ڕۆژەی مــرد بەو چەشــنە دەژیــا. (أســلم) لەپــێش مردنیــدا وەسییەتی کرد بۆ (علي بن أبو طاليب)، تا وریای منداڵەکانی بێت؛ ئەویش وەسیەتەکەی بەجێگەیاند و سەرپەرشتی منداڵەکانی (أسلم)ی دەکرد.

**پرسیار:**

١- (أسلم) لە بنەڕەتدا خەڵکی کوێ بوو؟ چۆن گەیشتە (مكة)؟

٢- بۆچی (أبولهب) (أسلم)ی ئازار دا؟

٣- پەیوەندی نێوان (أسلم) و پێغەمبەر(ﷺ) چۆن بوو؟

٤- (أسلم) کەی، موسڵمان بوو؟

٥- بۆچی (عباس) بە دیل گیرا؟

٦- کام بەسەرهاتەی ناو ئەم ژیانە زۆر لات کاریگەر بوو؟

## ١٤-(بشير بن سعد)(رضي الله عنه)

ئەم هاوەڵەی باسی دەکەین یەکێکە لە دانیشتوانی (مدينة) و لە هاوەڵە پشتیوانییەکانە، ناوی (بشير بن سعد)ە، برایەکی هەبوو ناوی (سماک) بوو،کە ئەویش هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو.

(بشير) پێش موسڵمانبوونیشی خوێنەواری هەبوو و دەیتوانی هەم نووسین بخوێنێتەوە و هەم بنووسێت، ئەوەش شتێکی زۆر گرنگ بوو، چونکە لەو کاتەدا خوێندەواری لە (مكة) و (مدينة)شدا زۆر کەم بوو.

کاتێک موسڵمانانی (مدينة) چوون بۆ (مكة) بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و لە عەقەبەدا بەیعەتیان پێدا، (بشير)یش هاودەم بە پشتیوانان بەشداری بەیعەتی عەقەبەی کرد.

دواتر، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی کرد بۆ (مدينة)، (بشير) بەردەوام دەچوویە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و گوێی لە فەرمایشتەکانی دەگرت و لە کاتە خۆش و سەختەکانیشدا لە

دەوری پێغەمبەر(ﷺ) بوو. ئەوەبوو لە غەزای بەدر و ئوحود و هەموو غەزاکانی دواتریشدا بەشداری کرد و ئامادە بوو لە پێناو سەرخستنی ئایینی خوادا ماڵ و گیانی ببەخشێت.

جارێک (عمرة بنت رواحة) کە ژنی (بشیر) بوو داوای لە (بشیر) کرد لەو ماڵ و سامانەی کە هەیەتی بەشێک ببڕێتەوە بۆ کوڕەکەی، بەڵام (بشیر) ڕازی نەبوو، ژنەکەشی هەر لێی دووبارە دەکردەوە. تا پاش یەک ساڵ (بشیر) ڕازی بوو. (عمرة) وتی: نا بەخوا ڕازی نابم، تا دەستی نەگریت و نەیبەیت بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێغەمبەری خوا(ﷺ) بکەیت بە شایەت. (بشیر)یش منداڵەکەی هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من بەشێکی سامانم بڕیوەتەوە بۆ ئەم کوڕەم و دایکی ئەم کوڕەشم دەیەوێت تۆ شایەت بیت لەسەر ئەوە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئایا جگە لەمە منداڵی ترت هەیە؟

وتی: بەڵێ.

فەرمووی: ئایا ئەوەی بۆ ئەمت بڕیوەتەوە بۆ هەموو منداڵەکانی تریشت بڕیوەتەوە؟

(بشیر) وتی: نا.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (دەی من نابمە شایەت بۆ شتی وا، ئەوە ستەمە، بڕۆ کەسی تر جگە لە من بکە بە شایەت بۆچیلە

نێوان منداڵەکانتاندا دادپەروەر بن لە بەشدا وەک چۆن حەز دەکەن ئەوان لە چاکە و میهردا لەنێوانتاندا دادپەروەر بن).

**پەند و وانە:**

ئەمە نموونەیەکی جوانە، تا دایک و باوک فێری ئەوە بن، تا دەتوانن لە نێوان منداڵەکانیاندا دادپەروەر بن و ستەم لە هیچکامیان نەکەن. ئەگەر تەنانەت لە ناخیشەوە منداڵێکیان لەوانی تر خۆش بوێت ئەوە نابێت دەری ببڕن و هەروەها لە مافدا نابێت مافی ئەوانی تر بخۆن بۆ ئەو منداڵە، چونکە هەر جیاوازی کردنێک ستەمە و دەبێتە هۆی دڵڕەنجانی ئەوانی تر و مافیان دەخورێت، خواش دادپەروەری پێ خۆشە.

بەو جۆرە (بشیر) تا ژیا لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ) بوو، دوای ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد و خەڵکی ویستیان خەلیفەیەک دیاری بکەن، (بشیر) یەکەم کەسی ناو پشتیوانان بوو کە چوو بەیعەتی دا بە (أبوبکر الصدیق) و بە دوای ئەودا هاوەڵە پشتیوانییەکانی تریش بەیعەتیان پێدا. ئیتر لە خیلافەتەکەی (أبوبکر)یشدا بەردەوام بوو لەسەر کاری چاکە و چوون بۆ مزگەوت و ئەنجامدانی نوێژ و سەردان و خزمایەتی و جیهادی ڕێی خوا. ئەوەبوو لە جەنگی دژ بە بێباوەڕاندا بەشداری

دەکرد و دواجار لە ساڵی دوانزەی کۆچیدا لە جەنگێکدا شەهید بوو.

**پرسیار:**

١- بۆچی خوێندەواری (بشیر) گرنگ بوو؟

٢- بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) ئامادە نەبوو ببێتە شایەت بۆ (بشیر)؟

٣- ژنەکەی (بشیر) چ داواکاریەکی هەبوو؟

٤- (بشیر) چۆن وەفاتی کرد؟

## ١٥-(أسعد بن زرارة)(رضي الله عنه):

لە شاری (مدينة) بڕێک موسڵمان هەبوون کە هێشتا پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەچووبوو بۆ لایان، کەچی ئەوان چوون بۆ (مكة) بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بوون و دوایی گەڕانەوە بۆ (مدينة) و لەوێ بانگەوازیان دەکرد بۆ ئیسلام و چاوەڕێی هاتنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوون، بەم هاوەڵانە دەوترا پشتیوانان.

یەکێکیش لەوانە ناوی (أسعد بن زرارة) بوو. (أسعد) یەکەم کەسی ناو پشتیوانان بوو کە موسڵمان بوو، هاودەم بە هاوڕێیەکی بە ناوی (زكوان) موسڵمان بوو. (أسعد) کە موسڵمان بوو باسی ئیسلامی کرد بۆ ژن و منداڵەکانی و ئەوانیش هەموویان موسڵمان بوون.

(أسعد) سەرقاڵی کاری بازرگانی بوو و دەچوو بۆ (شام)، هەر لە پێش موسڵمانبوونیشی بڕوای بە بتپەرستی نەبوو و هەمیشە باسی یەکخواپەرستی دەکرد.

جارێک (أسعد) کە لە شامەوە دەگەڕایەوە، لەگەڵ چل کەسی هۆزەکەیدا بوو، خەونێکی دیت. لە خەونەکەیدا کەسێک هات و پێی وت: لە (مکة) پێغەمبەرێک دەردەکەوێت تۆش شوێنی بکەوە، بۆ دڵنیایی قسەکەشم نیشانەیەکت پێ دەڵێم: ئێوە دەچنە شوێنێک هەموو هاوڕێکانت لەناو دەچن و تەنها تۆ ڕزگارت دەبێت، فڵان کەسیش چاوی لەدەست دەدات. ئەوەبوو دوای ماوەیەک چوونە شوێنێک هەموو تووشی نەخۆشی تاعوون بوون جگە لە (أسعد) کە ڕزگاری بوو لەگەڵ یەکێکیان کە چاوی لەدەست دا.

پرسیار: (أسعد) کەی موسڵمان بوو؟

وەڵام: جارێک (أسعد) و (زکوان)ی هاوڕێی چوون بۆ (مکة) بۆ لای هاوڕێیەکیان بە ناوی (عتبة)، لەوێ هەواڵی پێغەمبەریان(ﷺ) بیست و چوون بۆ لای، پێغەمبەریش(ﷺ) بانگهێشتی کردن بۆ ئیسلام و قورئانی بۆ خوێندنەوە، ئەوانیش موسڵمان بوون.

دواتر (أسعد) لەگەڵ پشتیوانان‌دا بەشداری بەیعەتی یەکەم و دووەمی عەقەبەی کرد، ئەوکاتەش هێشتا تەمەنی زۆر نەبوو.

کاتێک (أسعد) چوویەوە بۆ (مدینة)، لەگەڵ دوو هاوڕێی تریدا بە نهێنی دەچوون بتەکانی هۆزەکەی خۆیان دەشکاندن، بە ڕۆژیش قسەیان بۆ خەڵک دەکرد، تا موسڵمان بن و وازبهێنن لە

بتپەرستی. لە کاتی نوێژەکانیشدا (أسعد) دەچوو بەرنوێژی دەکرد بۆ موسڵمانان، ئەوەش گەورەیی و لێهاتوویی ئەو کەسە بوو کە هەم بتەکانی لەناودەبرد و هەم بەرنوێژی بۆ موسڵمانان دەکرد و هەم هەوڵی دەدا خەڵکی تریش موسڵمان بن.

**پەند و وانە:**

دەبێت ئێمەش لە ژیانی (أسعد) و هاوەڵانی ترەوە فێری ئەوە بین، تا دەتوانین بانگەواز بکەین بۆ ئایینی خوا و هەر خراپە و هەڵەیەکمان بینی، هەوڵ بدەین ڕاستی بکەینەوە و خراپە نەهێڵین و هەرکەس خراپەی کرد تێی بگەیەنین کارێکی باش ناکات و وای لێ بکەین وازی لێ بهێنێت.

هەروەها دەبێت زۆر ئاگاداری نوێژەکانمان بین، ئەوانەی کە کوڕن نوێژەکانیان لە مزگەوتدا بکەن، ئەوانەش کە کچن لە کاتی خۆیدا لە ماڵەوە، یان لە هەر شوێنێکی ترن نوێژەکانیان بکەن، چونکە نوێژ هۆکارێکە بۆ چوونە بەهەشت.

کاتێک پشتیوانان داوایان کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) مامۆستایەکیان بۆ بنێرێت، تا قورئانیان فێر بکات، پێغەمبەر(ﷺ) (مصعب)ی نارد. (مصعب)یش کە هاتە (مدینة)، خێرا (أسعد) پێشوازی لێکرد و بردیەوە بۆ ماڵی خۆیان و بەردەوام خزمەتی دەکرد.

جارێک (أسعد بن زرارة)، (مصعب)ی برد، تا باسی ئیسلام

بکات بۆ خەڵکی، بەڵام (سعد بن موعاذ) و (أسید بن حضیر) کە گەورەی هۆزەکانیان بوون و هێشتا موسڵمان نەبووبوون، ئەوەیان پێ ناخۆش بوو، ویستیان ڕێیان پێ نەدەن. (أسعد) بە (مصعب)ی وت: ئەگەر ئەمانە موسڵمان بن خەڵکێکی زۆر بە هۆیانەوە موسڵمان دەبێت، (مصعب)یش بە جوانی باسی ئیسلامی کرد بۆیان و ئەوانیش موسڵمان بوون و بەهۆی ئەوانیشەوە خەڵکێکی زۆری ناو (مدینة) هاتنە ناو ئیسلامەوە.

ئیتر (أسعد) ماڵەکەی خۆی کردبوو بە شوێنی پێشوازی و حەوانەی ئەو موسڵمانانەی لە (مکة)وە دەهاتن و بە جوانی بەخێرهاتنی دەکردن.

**پەند و وانە:**

میوانداری و ڕێزگرتنی میوان ئەرکی سەرشانی موسڵمانە و هەرکەس بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەبێت دەبێت ڕێزی میوان بگرێت، هەروەها زۆر پێویستە هاوکار و دەستگرۆی کەسی بێگانە و نەدار بین، چونکە خوای گەورە هەموومان تاقی دەکاتەوە.

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی کرد بۆ (مدینة)، خێرا (أسعد) چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وشترەکەی پێغەمبەری(ﷺ) بردەوە بۆ لای خۆی و بە جوانی سەرپەرشتی دەکرد.

جارێک (أسعد) تووشی نەخۆشیەک بوو، جوولەکەکان تانەیان دەدا لە پێغەمبەر(ﷺ) و دەیانوت: ناتوانێت (أسعد) چاک بکاتەوە. پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ سەردانی (أسعد) و خۆی چارەسەری بۆ بەکاردەهێنا، (أسعد) وەسییەتی کرد دوای خۆی کچەکانی لەژێر چاودێری پێغەمبەردا(ﷺ) بن، بەڵام خوای گەورە بڕیاری دابوو (أسعد) بمرێت و بگەڕێتەوە بۆ لای خۆی، بۆیە چاک نەبوویەوە. ئیتر دوای مردنی (أسعد) پێغەمبەر(ﷺ) ئاگاداری کچەکانی بوو و ئەوانیش زوو زوو دەچوون بۆ ماڵی پێغەمبەر(ﷺ).

**پەند و وانە:**

ژیان و مردن و چاکبوونەوە هەموو شتێک بە دەستی خوایە، ئەگەر خوا ویستی لەسەر نەبێت هەموو دنیا ناتوانێت نەخۆشێک چاک بکاتەوە، تەنانەت پێغەمبەری خواش(ﷺ) بە بێ فەرمانی خوا توانای نەبووە کەس چاک بکاتەوە، بۆیە دەبێت تەنها پشت بە خوا ببەستین. هەروەها دڵنیا بین هەرچیەک خوا بیکات ئەوە باشە، ئەگەریش ئێمە حەز بەو شتە نەکەین، ئەوە خوای گەورە هەندێک شتی چاکتر دەزانێت کە ئێمە نایزانین، بۆیە دەبێت ڕازی بین بەوەی خوا دەیهێنێتە ڕێگەمان.

**پرسیار:**

١- پشتیوانان کێ بوون؟

٢- بەسەرهاتی (أسعد) و (مصعب) باس بکە بۆ کەسێکی زۆر خۆشەویستت.

٣- پێغەمبەر(ﷺ) بۆ نەخۆشیەکەی (أسعد) چی کرد؟

٤- ئەرکی موسڵمان بەرانبەر بە میوان چیە؟

٥- دەتوانیت چوار پەند و وانە لە ژیانی (أسعد) بژمێریت؟

## ١٦-(أبو أيوب الأنصاري)(رضي الله عنه)

بەسەرهاتی ئەمجارەشمان تایبەتە بە یەکێکی تر لە هاوەڵە پشتیوانییەکان کە ئەویش ناوی (خالد بن زيد)ە، و زیاتر بە (أبو أيوب الأنصاري) ناسراوە.

(أبو أيوب) یەکێک بوو لەو هاوەڵە پشتیوانیانەی کە زۆر زوو موسڵمان بوو و بەشداری بەیعەتی عەقەبەی کرد. دوای ئەوە گەڕایەوە (مدينة) و لەوێ سەرقاڵی کاری بانگەواز بوو، تا ئەو کاتەی پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی کرد بۆ (مدينة)، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) هاتە (مدينة)، یەکە یەکەی پشتیوانان داوایان دەکرد پێغەمبەر(ﷺ) بچێتە ماڵی ئەوانەوە. پێغەمبەر(ﷺ) پێی ڕاگەیاندن وشترەکەی لەبەردەم ماڵی کێدا مۆڵی خوارد دەچێتە ئەوێ، چونکە ئەو وشترە لەلایەن خواوە فەرمانی پێکراوە، وشترەکەش لەبەردەم ماڵی (أبو أيوب)دا مۆڵی خوارد.

خانووەکەی (أبو أيوب) دوو قات بوو، (أبو أيوب) پێغەمبەری خوای(ﷺ) لە قاتی یەکەم دانا و خۆی و خێزانی چوونە قاتی

سەرەوە. جارێک بڕێک ئاو لە ژوورەکەیاندا ڕژا، خێرا هەستان و بە بەرگ و ڕاخەرێک کە هەیانبوو ئاوەکەیان هەڵدەمژیەوە، بەڵام هەر کەمێک لە ئاوەکە داچۆڕایە خوارەوە، بۆیە (أبو أيوب) چوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) شیاو نییە ئێمە لە سەرەوە بین و تۆ لە خوارەوە بیت، پێم خۆش نییە بەسەر جەنابتانا بچمە سەرەوە و ئێوە لە خوارەوە بن، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خوارەوە بۆ من ئاسوودەترە، (أبو أيوب)یش وتی: قەت ناچمە قاتی سەرەوە جەنابتان لە خوارەوە بن، ئیتر (أبو أيوب) چوویە خوارەوە. زۆر جار خواردنی ئامادە دەکرد، بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و بۆی دەبرد، کاتێک بۆی دەگێڕایەوە (أبو أيوب) تەماشای دەکرد پێغەمبەر(ﷺ) لە کوێدا پەنجەی داناوە لەو بەشەی دەخوارد.

(أبو أيوب) دەڵێت: کە خواردنێک دەهێنرا بۆ ماڵی پێغەمبەر(ﷺ)، لێی دەخوارد و زیادەکەی، دەنارد بۆ ئێمە، ڕۆژێک خواردنێکی بۆ هاتبوو هەمووی ناردبوو و هیچی لێ نەخواردبوو، چونکە سیری تێدا بوو، منیش وتم: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ حەرامە؟

فەرمووی: (نا، بەڵام من لەبەر بۆنەکەی ڕقم لێیەتی).

(أبو أيوب)یش وتی: دەی منیش حەز بە شتێک ناکەم کە تۆ حەزی پێ نەکەیت.

(أبو أيوب) دەڵێت: جارێک لای پێغەمبەر(ﷺ) بووم کە کەسێک هات بۆ لای و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئامۆژگاریەکی کورت و پوختم بکە. ئەویش فەرمووی: (کاتێک هەستایت نوێژت کرد وەک ئەو کەسە نوێژ بکە کە نوێژی ماڵئاوایی دەکات، قسەیەکیش مەکە کە دواتر پۆزشی بۆ بهێنیتەوە، هیچ چاوت نەبێت لەوەی لە دەستی خەڵکدایە).

**پەند و وانە:**

ئەم ئامۆژگاریانە وانەی زۆر گەورەیان تێدایە بۆ ئێمەی موسڵمان، کاتێک نوێژ دەکەین نابێت پەلەی تێدا بکەین و بڵێین، با جارێکی تر. بەڵکو پێویستە هەر نوێژێکمان وا بکەین دڵنیا بین خوای گەورە لێمان وەردەگرێت. هەروەها لەکاتی قسەکردندا دەبێت بیرمان لە داهاتوو بێت و قسەیەک نەکەین دوایی لێی پەشیمان بین، هاوکات نابێت چاومان لە سامانی کەس بێت، چونکە موسڵمان هەم دەبێت لە بەری ڕەنجی خۆی بخوات، هەروەها کە چاوی لە سامانی خەڵک نەبوو ئەوە لای خەڵک خۆشەویست دەبێت.

(أبو أيوب) دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو:(حەڵاڵ نییە بۆ هیچ کەسێک لە سەروو سێ ڕۆژەوە پشت لە براکەی بکات، ئیتر وایان لێ بێت کە دەگەن بە یەک هەرکامە و پشت

بکاتە ئەویان، چاکترینیشیان ئەوەیە کەپێشتر سەلام دەکات).

(أبو أیوب) لە دوا ساتەکانی تەمەنیدا نەخۆش کەوت، سوپایەک ئامادە کرا بۆ غەزا و سەرکردەی سوپاکە (یزید بن معاویة) بوو، ئەو سوپایە بەرەو (قسطنطینیة) بەڕێکرا. (یزید) هات بۆ لای و وتی: چیت پێویستە؟

(أبو أیوب) وتی: ئەگەر هاتوو مردم تەرمەکەم هەڵبگرە و بیبە لە خاکی دوژمندا ئەسپەردەم بکە. ئەوەبوو کە مرد (یزید) تەرمەکەی برد و لەوێ ئەسپەردەی کرد، تەرمەکەی برا لە لێواری شوورا کانی (قسطنطینیة)دا ئەسپەردەکرا.

**پرسیار:**

١- پێغەمبەر(ﷺ) کە چوویە (مدینة) لە ماڵی کێ نیشتەجێ بوو؟

٢- بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو خواردنەی نەخوارد کەبۆی هێنرابوو؟

٣- کاتێک کابرا داوای ئامۆژگاری کرد، پێغەمبەر(ﷺ) چی پێ فەرموو؟

٤- تا چەند ڕۆژ دروستە دوو موسڵمان پێکەوە قسە نەکەن؟

٥- باسی مردنی (أبو أیوب) بکە.

## ١٧- (حسان بن ثابت)(رضي الله عنه)

شاری (مدینة) پیاوی گەورە و چاکەکار و دڵسۆزی زۆری تێدا بوو، ئەو شارەی دواتر بوو بە بنکە و پەناگە و شوێنی ژیان و حەوانەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، یەکێک لەو پیاوە دڵسۆزانەش بریتی بوو لە (حسان).

(حسان بن ثابت) یەکێک بوو لە هاوەڵە پشتیوانییەکان، دایکی ناوی (فریعة) بوو، موسڵمانیش بوو وە پێغەمبەری خوای بینی. دوو برایشی هەبوو بە ناوەکانی (أبي) و (أوس) کە هەردووکیان موسڵمان بوون. (حسان) شاعیری ناسراو و ڕێزداری پێغەمبەر(ﷺ) بوو، ئەم هاوەڵە بە شیعرەکانی بەرگری زۆری لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد و هێرشی دەبردە سەر بێباوەڕان.

(حسان) بەسەرهاتێکی تەمەنی منداڵی خۆی دەگێڕێتەوە و دەڵێت: من حەوت، یان هەشت ساڵ بووم، ڕۆژێک زوو دەمەو بەیان بوو، جوولەکەیەکم بینی لە (مدینة)دا قسەی بۆ جوولەکەکان دەکرد، ئەوانیش کۆبوونەوە، منیش لێیانەوە نزیک

بووم و گوێم لێ دەگرت. کابرا وتی: وا ئەستێرەی ئەو (احمد)ە درەوشایەوە کە بڕیارە ئەمشەو لەدایک بێت واتە: بەوانی وت: کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەدایک بووە، ئیتر (حسان) زانی بەم زوانە پێغەمبەری خوا دێت و پەیامی خوا بە خەڵکی دەگەیەنێت.

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی هات بۆ (مدینة)، (حسان) تەمەنی زۆر بوو و نزیکەی شەست ساڵ دەبوو.

ڕۆژێک (أبوطلحة) بڕێک لە سامانەکەی خۆی کرد بە خێر و هێنای بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش دابەشی کرد بە (أبي بن کعب) و (حسان بن ثابت) و (شداد بن أوس) و چەند کەسێکی تردا.

پرسیار: (حسان) لە کاتی جەنگدا چی دەکرد؟

وەڵام: لە کاتی جەنگی دژ بە بێباوەڕاندا پێغەمبەر(ﷺ) بە (حسان)ی دەفەرموو: ئادەی بە شیعر هێرش بکەرە سەر بێباوەڕان و بێخەم بە، چونکە (جبریل) کە فریشتەی خوایە، لەگەڵتدایە و پشتیوانیت دەکات.

پێغەمبەر(ﷺ) لە مزگەوتی (مدینة)دا مینبەرێکی دانابوو بۆ (حسان) و (حسان) لەسەری دەوەستا و بە شیعر بەرگری لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد، پێغەمبەریش(ﷺ) دەیفەرموو: تا (حسان) بەرگری لە پێغەمبەر(ﷺ) بکات خوای گەورە پاڵپشتی (حسان) دەکات.

ئەی بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) سزای (حسان)ی دا؟

وەڵام: چونکە کاتێک دووڕووەکان کەوتنە بوختان کردن بۆ دایکی باوەڕداران (عائشة) و تۆمەتی داوێن پیسییان دایە پاڵ. لەناو (مدینة)دا لە هەموو شوێنێک درۆیان دەکرد، هێندە درۆیان دەکرد، تا چەند کەسێک باوەڕیان پێکردن، یەکێک لەوانەش (حسان) بوو کە بە درۆکانی ئەوان هەڵخەڵەتا و پشتگیری کردن. دواتر کە خوای گەورە بە ئایەتی قورئان پشتگیری لە دایکمان (عائشة) کرد، پێغەمبەر(ﷺ) سزای ئەو کەسانەی دا کە بەشداری ئەو تۆمەتە بوون، (حسان)یش سزا درا، بەڵام ئەمە واینەکرد پێغەمبەر(ﷺ) ڕقی لە (حسان) بێت، چونکە زانی هەڵخەڵەتاوە و لە ڕقەوە ئەو ئیشەی نەکردووە.

## پەند و وانە:

دەبێت زۆر وریا بین بە درۆ و فێڵی کەسانی دووڕوو و هەڵنەخەڵەتێین و خۆمان بپارێزین لە بڕواپێکردنیان، بەتایبەت لەمڕۆدا لە کەناڵەکانی تەلەفزیۆنەوە خەڵکێکی زۆر درۆ دەکەن و هەوڵ دەدەن موسڵمانان بە خراپ و ناشیرین نیشان بدەن و هێرش بکەنە سەر ئیسلام، نابێت بڕوا بەو کەسانە بکەین و خۆمان بەدواداچوون بکەین بۆ ڕاستیەکان.

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد، (حسان) زۆر دڵتەنگ بوو و بە شیعر پێغەمبەری خوای(ﷺ) دەلاواندەوە.

دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ)، جارێک (حسان) لە مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) شیعری دەهۆنییەوە، (عمر) دای بە لایدا و ڕێگری لێکرد و وتی: بۆچی لە مزگەوتدا شیعر دەهۆنیتەوە؟! ئەویش وتی: من کاتی خۆی لە مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) شیعرم دەهۆنییەوە و کەسی لە تۆ باشتریشی تێدا بوو (مەبەستی پێغەمبەر(ﷺ) بوو). (عمر)یش وتی: ڕاست دەکەیت، بۆیە وازی لێهێنا.

(حسان) پاش تەمەنێکی زۆر بینایی لەدەست دا، جارێک چوو سەردانی دایکی باوەڕداران (عائشة)ی کرد، (عائشة)ش ڕاخەرێکی بۆ دانا. ئەوەبوو (عبدالرحمن)ی برای (عائشة) هاتە ژوورەوەو وتی: خۆ ئەمە لە کاتی تۆمەتی دووڕووەکاندا پشتگیری ئەوانی کرد.

(عائشة)ش وتی: (حسان) لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) دەهاتەوە جواب و بەرگری لێدەکرد و بە لێدانی دوژمنانی پێغەمبەر(ﷺ) ئاسوودەیی دەبەخشی بە دڵ و دەروونی پێغەمبەر(ﷺ). من زۆر هیوام هەیە (حسان) لە ڕۆژی دواییدا هیچ سزا نەدرێت.

(حسان) پاش تەمەنێکی زۆر کە زیاتر لە سەد ساڵ دەبوو کۆچی دوایی کرد، بەڵام شیعرەکانی کە بەرگری کردن بوو لە پێغەمبەر(ﷺ) لە دوای خۆیشی مانەوە و موسڵمانان دەیانوتنەوە.

**پرسیارەکان:**

١- (حسان) لە پشتیوانان بوو، یان لە کۆچەران بوو؟
٢- کێ پشتیوانی لە (حسان) دەکرد؟
٣- بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) سزای (حسان)ی دا؟
٤- پەیوەندی نێوان (حسان) و (عائشة) چۆن بوو؟
٥- بەسەرهاتی (حسان) و (عمر) چۆن بوو؟
٦- لە ژیانی (حسان)ەوە فێری چی بوویت؟

## ١٨- (خديجة بنت خويلد)
## (دایکی باوەڕداران) (رضی الله عنها)

ئەم ئافرەتە خواناسەی باسی دەکەین هاوسەری پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو، ئافرەتێک بوو کە هەر لە دونیادا موژدەی بەهەشتی پێ درا، ئەویش ناوی (خديجة بنت خويلد) بوو، یەکەم ئافرەتی موسڵمان بوو، بەڵکو یەکەم کەسی سەر زەوی بوو باوەڕی هێنا بە پێغەمبەر(ﷺ).

(خديجة) سەرەتا هاوسەری کابرایەک بوو بە ناوی (هالة)، (أبي هالة بن زرارة) بوو، دوای ئەو شووی کرد بە پیاوێکی تر بە ناوی (عتيق) کە ئەو پیاوەی مرد، ئینجا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)هاوسەرگیری کرد.

(خديجة) لەناو هۆزەکەیدا زۆر ناسراو بوو، چونکە هەم لە خێزانێکی ناسراو بوو، هەم سامانێکی زۆر زۆری هەبوو و هەموان حەزیان دەکرد ئەو ئافرەتە بخوازن.

(خديجة) هێندە بە پاکداوێن ناسرابوو کە لە ناو هۆزەکەیدا بە ئافرەتە پاکەکە بانگیان دەکرد.

(خديجة) سامانێکی زۆری هەبوو، بۆیە داوای لە پیاوانێکی شارەزا دەکرد، تا کاری بازرگانی بۆ بکەن. بەرانبەر بەوە بڕێک

قازانجی دەدا پێیان. جا کاتێک ڕاستگۆیی و دەستپاکی پێغەمبەری خوای(ﷺ) بیست بڕیاریدا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) مامەڵە بکات، بۆیە داوای کرد لە پێغەمبەر(ﷺ)، تا کاری بازرگانی بۆ بکات. پێغەمبەریش(ﷺ) ڕازی بوو، ئەوکات هێشتا نەبووبوو بە پێغەمبەر و لە تەمەنی لاویدا بوو، پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ (میسرة)ی خزمەتکاری (خدیجة)دا چوو بۆ (شام)، تا کاری بازرگانی بکات بۆ (خدیجة) کە گەیشتنە (شام) پێغەمبەر(ﷺ) لە ژێر سێبەری دارێکدا دانیشت. کابرایەکی زانای مەسیحی ئەوی بینی بە (میسرة)ی وت: ئەم کابرایە کێیە؟

ئەویش وتی: کەسێکی قورەیشیە.

زاناکە وتی: تەنها پێغەمبەران لەژێر سێبەری ئەم دارەدا دانیشتون، بۆیە هەرگیز لێی جیا مەبەرەوە، ئەو کۆتای پێغەمبەرانە و خۆزگە منیش دەگەیشتمە کاتی پێغەمبەرایەتیەکەی. ئینجا کە هاتنەوە (خدیجة) قازانجی زۆر زۆری کرد لەو کارەی پێغەمبەر(ﷺ)، هەروەها (میسرة) بەسەرهاتەکەی بۆ (خدیجة) گێڕایەوە. ئەوەبوو دڵی چوویە سەر پێغەمبەر(ﷺ) و پێشنیازی خۆی کرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، تا ببێتە هاوسەری. پێغەمبەریش(ﷺ) ڕازی بوو و چوویە داوای و بە هاوسەری گرت و ژیانێکی خۆش و پڕ لە ڕێز و خۆشەویستییان دەست پێکرد و ماوەی بیست وپێنج ساڵ پێکەوە ژیان.

(خدیجة) لە ماوەی ژیانی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) زۆر ڕێزی دەگرت لێی و بە گەورە تەماشای دەکرد و پێغەمبەر(ﷺ) هەر چی بفەرمووایە، ئەو بڕوای پێدەکرد. (خدیجة) خزمەتکارێکی کڕیبوو بە ناوی (زید) کە بینی پێغەمبەر(ﷺ) (زید)ی زۆر خۆشدەوێت (زید)ی پێ بەخشی.

کاتێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) سرووشی بۆ دابەزی جۆرێک لە ترس دایگرت و گەڕایەوە ماڵەوە بۆ لای (خدیجة)ی خێزانی. فەرمووی: (دامپۆشن، دامپۆشن)، ئەویش دایپۆشت، تا پێغەمبەر(ﷺ) حاڵی ئاسایی بوویەوە. ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) مەسەلەکەی گێڕایەوە بۆ (خدیجة) و فەرمووی: (بەڕاستی لە حاڵی خۆم دەترسم). (خدیجة)ش پێی وت: نەبەخوا هەرگیز خوا سەرشۆڕت ناکات، چونکە تۆ پەیوەندی خزمایەتیت هەیە هاوکاری خەڵکیت و دەستگرۆیی هەژارانیت و ڕێزی میوان دەگریت و خزمەتی دەکەیت. ئینجا پاش ئەو دڵدانەوەیە، (خدیجة) پێغەمبەری خوای(ﷺ) برد بۆ لای (ورقة بن نوفل) کە کابرایەکی مەسیحی بوو و زۆر شارەزا بوو، کابرایەکی پیری نابینا بوو. (خدیجة) پێی وت: ئامۆزاکەم گوێ لە (محمد) بگرە بزانە چی دەڵێت، (ورقة) بە وردی گوێی گرت لە پێغەمبەر(ﷺ) و دواجار پێی وت: کە ئەو بووە بە پێغەمبەری خوا(ﷺ).

**پەند و وانە:**

پێویستە ژن و مێرد هەمیشە پشتیوان و دڵنەوای یەکدی بن، ئێمەی منداڵانیش، ئەگەر بینیمان دایک و باوکمان لەگەڵ یەکدی چاک نەبوون، یان کێشەیەکیان هەبوو، دەبێت هانیان بدەین ڕێزی یەک بگرن، نابێت دژی یەکێکیان بوەستینەوە و پشتیوانی ئەوی تریان بکەین، بەڵکو دەبێت نێوانیان چاک بکەینەوە و نموونەی دایکە (خدیجة) و پێغەمبەری خوایان بۆ باس بکەین.

جارێک (خدیجة) خواردنی ئامادە کردبوو بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و چوو بەرەو بەرزاییەکانی (مکة)، تا خواردنەکەی بۆ ببات. لە ڕێدا (جبریل) خۆی لە شێوەی مرۆڤێکدا نیشان دا و پرسیاری پێغەمبەری خوای(ﷺ) لە (خدیجة) کرد. (خدیجة)ش ترس دایگرت و ترسا کەسێکی خراپ بێت و نیازی کوشتنی پێغەمبەری خوای(ﷺ) هەبێت، دواتر کە (خدیجة) چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە. ئەویش فەرمووی: (ئەوە (جبریل) بوو، فەرمانی پێکردم سەلامت پێ بگەیەنم)، ئینجا موژدەی دا بە (خدیجة) کە لە بەهەشتدا خانوویەکی خۆشی بۆ تایبەت کراوە.

**پرسیار: (جبریل) کێیە؟**

وەڵام: (جبریل) فریشتەیەکی تایبەتی خوایە کە پەیامی خوای هێناوە بۆ هەموو پێغەمبەران.

(خدیجة) پشتیوانێکی گەورە بوو بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵکو هەرکات پێغەمبەر(ﷺ) لە دەرەوە بە دەست بێباوەڕانەوە قسەی ناخۆشی بەرانبەر بکرایە کە دەگەڕایەوە ماڵەوە (خدیجة) خەفەتی سەر شانی لادەبرد.

(خدیجة) دایکی هەموو منداڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو جگە لە ئیبراهیم، چونکە دایکی (إبراهیم) ناوی (ماریة) بوو، ویستی خواش وابوو (خدیجة) هەر لە ژیانی خۆیدا مەرگی هەموو کوڕەکانی بینی، بەڵام هیچ ناڕەزاییەکی دەرنەبڕی و زۆر سوپاسگوزار بوو.

پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: (چاکترین ئافرەتانی بەهەشت بریتین لە: (خدیجة بنت خویلد) و (فاطمة بنت محمد) و (مریم بنت عمران) و (اسیة بنت مزاحم) کە ژنی فیرعەون بوو).

(خدیجة) لە هەموو ناڕەحەتییەکاندا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بوو، تەنانەت لە گەمارۆدانی سەختی هاشمیەکانیشدا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) لە شیوەکەدا بوو. جارێک (حکیم بن حیزام) ویستی بڕێک گەنم بەرێت بۆ (خدیجة)ی پووری، بەڵام (أبو جهل) ڕێی پێگرت. کابرایەک هات و وتی: ئەوە چیتانە؟ (أبو جهل) وتی: ئەمە خواردن دەبات بۆ هاشمیەکان.

کابرا وتی: بۆ پووری خۆی دەبات ڕێی ئەوەشی لێ ئەگریت؟ ڕێی بۆ چۆڵ کە کابرا، بەڵام (أبوجهل) ڕازی نەبوو، بۆیە کەوتنە دەمەقاڵە.

لەو کاتی گەمارۆ و ناڕەحەتیەدا (خدیجة)ی ژنی

خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) و یەکەم ئافرەتی موسڵمان و مژدەپێدراوی بەهەشت کۆچی دوایی کرد، مردنەکەی زۆر کاریگەری هەبوو لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) و پێی خەفەتبار بوو، هەر بۆیە ئەو ساڵە بە ساڵی خەفەت ناسراوە.

خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ (خدیجة) بە مەرگی (خدیجة) کۆتایی پێ نەهات، بەڵکو زۆرجار بە چاکە باسی دەکرد، هەر ناوی بهاتایە نزای خێری بۆ دەکرد، هەرکەس خۆشەویستی (خدیجة) بوایە، پێغەمبەر(ﷺ) پەیوەندی لەگەڵ نەدەپچڕاند، کۆمەک و یارمەتی، دەنارد بۆ هاورێکانی (خدیجة)، ئەمەش نموونەی وەفاداری پێغەمبەری خوایە(ﷺ).

**پرسیار:**

١- تایبەتمەندیەکانی (خدیجة) چین؟

٢- هاوسەرگیری (خدیجة) و پێغەمبەر(ﷺ) چۆن بوو؟

٣- بەسەرهاتی زانا مەسیحیەکە چیە؟

٤- ئایا (خدیجة) دەچێتە بەهەشتەوە؟

٥- ساڵی خەفەت چیە؟

## ١٩-(أبان بن سعيد)(رضي الله عنه):

لەنــاو (مكـــة)دا بنەمــاڵەیەک هەبـــوون ناســـرابوون بە ئومەوییەکان، ئەمانە بنەماڵەیەکی ناسراو و بەهێز بوون، جا کاتێـک ئـایینی ئیسـلام هـات، زۆرێـک لە ئەنـدامانی ئەم بنەمـــاڵەیە دژایەتـــی پێغەمـــبەری خوایـــان دەکـــرد، بەڵام ژمارەیەکیشیان هەر لە سەرەتای هاتنی ئیسلامەوە موسڵمان بوون و بانگەوازیان دەکرد بۆ ڕێبازی ئیسلام.

(أبـان بـن سـعيد)یش سـەر بە بنەمـاڵەی ئومەوییەکـان بـوو، دایکی (أبان) ناوی (صفية) بوو، باوکی (أبان) یەکێک بوو لە کەسە ناودارەکانی ناو (مكة)، (أبان) حەوت برای هەبوو، سێ لەو برایانەی بە بێباوەڕی مردن، چواریشیان بە موسڵمانی مردن.

(أبـان) لە (مكـة) کەسێکی بەرچاو بوو و سـەرقاڵی کـاری بازرگانی بوو و بۆ کاری بازرگانی زوو زوو دەچوو بۆ (شام).

هەریەک لە (عمرو) و (خالد) کە برای (أبان) بوون هەر زوو موسڵمان بـوون، بەڵام (أبـان) بە بێبـاوەڕی مـایەوە، (أبـان) بێزار

بوو بەرانبەر موسڵمانبوونی براکانی و بە شیعر سەرکۆنەی دەکردن.

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتی دا بە موسڵمانان کۆچ بکەن بۆ (حبشة)، ئەو دوو برایەی لەگەڵ موسڵمانانی تردا کۆچیان کرد بۆ (حبشة).

(أبان)یش بە بێباوەڕی مایەوە و لە جەنگی بەدردا دژ بە موسڵمانان جەنگا، لەو جەنگەدا دوو برای بێباوەڕی کوژران، بەڵام خوا ڕەحمی کرد بە (أبان) و بە سەلامەتی دەرچوو و گەڕایەوە بۆ (مكة) و لەوێ بەردەوام سەرقاڵی کاری بازرگانی بوو.

**پەند و وانە:**

دەبێت سوپاسی خوا بکەین کە دایک و باوک و برا و خوشک و کەسوکارمان موسڵمانن، چونکە ئەگەر بێباوەڕ بوونایە و بە بێباوەڕی بمردنایە، ئەوە بەهەشتی هەتا هەتاییان لەدەست دەدا، جا چەندە ناخۆشە کەسە ئازیز و خۆشەویستەکانت بێبەش بن لە بەهەشتی بەرین.

جارێک (أبان) چوو بۆ (شام) لەوێ چاوی کەوت بە ڕاهیبێک (واتە: زانای ناو ئایینی مەسیحی) و لەگەڵی

دانیشت. (أبان) پێی وت: لەناو ئێمەدا لە ناو قورەیش کەسێک دەرکەوتووە بانگەشەی ئەوە دەکات گوایە، پێغەمبەری خوایە، و خوا پەیامێکی وەک پەیامەکەی (موسی) و (عیسی)ی پێدا ناردووە.

ڕاهیبەکە وتی: ناوی چییە؟

وتی: ناوی (محمد)ە، ڕاهیبەکە وتی: من وەسفی ئەو پێغەمبەرە و تەمەن و ڕەچەڵەکیت بۆ ئەکەم کە ڕاهیبەکە وەسفەکانی کرد. (أبان) وتی: خۆیەتی. ڕاهیبەکە وتی: دەی سوێند بەخوا زاڵ ئەبێت بەسەر هەموو عەرەبدا و دواتر بەسەر هەموو زەویشدا زاڵ ئەبێت. بە (أبان)ی وت: سەلامی من بگەیەنە پێی، (أبان) کە گەڕایەوە (مكة) باسی ئەو مەسەلەی کرد و هەواڵی پێغەمبەر و هاوەڵانی پرسی، ئینجا لە ڕێککەوتنی حودەیبیەدا موسڵمان بوو.

**پەند و وانە:**

لە ئایینەکانی پێشتردا باسی هاتنی پێغەمبەری ئیسلام کراوە و لە کتێبە پیرۆزەکانیاندا باسی هاتووە، بەڵام دواتر خەڵکانێک لەناو ئەو ئایینانەدا کە حەزیان نەدەکرد موسڵمان بن هەوڵیان دا ئەو ڕاستییە بشارنەوە و هەرچیەک باسی پێغەمبەری ئیسلامی تێدا بوایە، دەیانسڕیەوە، بۆیە دەبێت ئاگادار بین بە پیلانی کەسانی فێڵباز هەڵنەخەڵەتێین و لەوە دڵنیابین کە (محمد) (ﷺ) پێغەمبەری خوایە.

کاتێک موسڵمانان بە هاودەمی پێغەمبەر(ﷺ) بەڕێکەوتن بۆ عومرە و بێباوەڕان بەریان پێگرتن، پێغەمبەر(ﷺ) (عثمان بن عفان)ی نارد تا بچێت بۆ (مكة) و لەگەڵ بێباوەڕاندا قسە بکات، کاتێک (عثمان) چوو بۆ (مكة) (أبان) پەنای داو ڕێی نەدا کەس ئازاری بدات و سواری ئەسپەکەی خۆی کرد و وتی: بە بێ ترس بە ناو (مكة)دا بگەڕێ.

(خالد) و (عمرو) کە برای بوون هەواڵیان نارد بۆ (أبان) و بانگهێشتیان کرد بۆ ئیسلام و داوایان کرد بچێت بۆ (مدينة). (أبان)یش کۆچی کرد بۆ (مدينة) و موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند.

ئیتر (أبان) لای پێغەمبەر(ﷺ) ڕێزی زۆری لێدەگیرا و جێی متمانەی بوو، چونکە موسڵمان بوونەکەی ڕاستگۆیانە بوو.

پێغەمبەر(ﷺ) (أبان)ی کردە سەرکردەی سوپایەک بەرەو ناوچەی نەجد، هەروەها ئەرکی تریشی پێ سپارد و تا کاتی وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) (أبان) لەو پۆستەدا مایەوە، بەڵام کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد (أبان) زۆر دڵتەنگ بوو، بۆیە کاتێک خەلیفە (أبوبکر) داوای لێکرد لەسەر ئەو پۆستە بمێنێتەوە (أبان) ڕازی نەبوو و وتی: دوای پێغەمبەر(ﷺ) هیچ بەرپرسیارێتیەک وەرناگرم.

دوای ئەوە (أبان) لە مەیدانی جیهاددا دەجەنگا و بەشداری جەنگی دژ بە بێباوەڕانی دەکرد، تا ئەوەی هاودەم بە (خالد)ی برای لە جەنگێکدا بەشداری کرد و هەردووکیان شەهید بوون.

## پرسیار:

١- (أبان) سەر بە چ بنەماڵەیەک بوو؟

٢- (أبان) کەی، موسڵمان بوو؟

٣- بۆچی (أبان) وازی هێنا لە پۆست و بەرپرسیارێتی؟

٤- دەتوانیت بەسەرهاتی (أبان) بۆ کەسێکی خۆشەویستت باس بکەیت؟

## ٢٠- (سلمة بن الأكوع) (رضي الله عنه)

ناوی (سلمة بن عمرو) بەڵام باوکی زیاتر بە (الأكوع) ناسراوە، یەکەم دەرچوون کە(سلمة) هاودەم بە پێغەمبەر (ﷺ) بەشداری کرد بریتی بوو لە ڕێککەوتنی حودەیبیە، لەوێ (سلمة) بەیعەتی مەرگی دا بە پێغەمبەر (ﷺ)، واتە بەڵێنی دا گوێڕایەڵی فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) بێت. تەنانەت ئەگەر لەو پێناوەشدا بکوژرێت.

(سلمة) دەڵێت: جارێک لە شوێنێ بووین نێوانی ئێمە و دوژمن شاخێک بوو، پێغەمبەر (ﷺ) نزای لێخۆشبوونی کرد بۆ ئەو کەسەی ئەو شەوە پاسەوانی ئەو شاخە بکات. منیش ئەو شەوە دوو، یان سێ جار بەسەر ئەو شاخەدا سەرکەوتم، دواتر هاتینەوە (مدینة)، ئینجا هێرش برایە سەر وشترەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و شوانەکەی کوژرا، منیش کەوتمە شوێن هێرشبەرەکان و توانیم ڕێیان لێبگرم. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (چاکترین پیادەمان (سلمة) بوو). پاشان پێغەمبەر (ﷺ) تا (مدینة) (سلمة)ی لە دوای خۆیەوە لەسەر وشترەکە سوار کرد. کابرایەکی پشتیوانی بە خێرایی بە پیادە دەڕۆیشت و زوو زوو

دەیوت کەس نییە، تا (مدینة) پێشبڕکێم لەگەڵ بکات؟ (سلمة) دەڵێت: منیش کە ئەوەم بیست وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە دایک و باوکمەوە بەقوربانت بم مۆڵەتم بدە، با لەگەڵ ئەو کابرایە پێشبڕکێ بکەم. فەرمووی: ئەگەر خۆت بتەوێت باشە. بە کابرام وت: کەمێکیش پێشکەوە، ئینجا کەوتمە ڕێ. خۆم گەیاندەوە پێی و دام بە نێو شانیدا و وتم: بەخوا پێشت کەوتم، ئەوەبوو زووتر گەیشتمە (مدینة).

**پەند و وانە:**

دەبێت هەر کات بینیمان دوژمن لە لایەکەوە دەیەوێت زیان بگەیەنێت بە موسڵمانان، دەبێت ڕێی لێ بگرین و نەهێڵین دەستی خۆی بوەشێنێت، چونکە موسڵمانان هەموویان برای یەکترن، هەروەها لەم بەسەرهاتەوە ئەوەش تێدەگەین هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) سوعبەت و قسەی خۆشیان لەگەڵ یەکدا هەبووە، وەک چۆن (سلمة) و هاوەڵە پشتیوانییەکە پێکەوە، تا (مدینة) پێشبڕکێیان کرد.

(سلمة) دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) بەشداری حەوت غەزام کرد، ئەمەش دلێری و پاڵەوانێتیەکی گەورەیە کە لەو هەموو جەنگەدا بەشدار بووە و دژ بە دوژمنانی ئیسلام جەنگاوە.

(سلمة) لە غەزای خەیبەردا قاچی تووشی پێکان بوو، پێغەمبەر (ﷺ) دەستی هێنا بەسەر قاچیدا و خێرا قاچی

(سلمة) چاک بوویەوە.

(سلمة) دەڵێت: جارێک لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) دانیشتبووین کە تەرمێکیان هێنا و وتیان: نوێژی لەسەر بکە.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئایا قەرزی لەسەرە؟

وتیان: نا.

فەرمووی: ئەی هیچی پاش خۆی جێهێشتووە؟

وتیان: نا. بۆیە نوێژی لەسەر کرد. دوای ماوەیەک تەرمێک هێنرا، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی لەسەر بکە.

فەرمووی: قەرزی لەسەرە؟

وتیان: بەڵێ.

فەرمووی: ئەی هیچی جێهێشتووە؟

وتیان: سێ دینار، ئەوەبوو نوێژی لەسەر کرد. دواتر تەرمی سێیەم هێنرا، وتیان: نوێژی لەسەر بکە.

فەرمووی: هیچی جێهێشتووە؟

وتیان: نا.

فەرمووی: ئەی قەرزی لەسەرە؟

وتیان: سێ دنیار.

فەرمووی: (خۆتان نوێژ لەسەر هاوەڵەکەتان بکەن). (أبو قتادة) کە لەوێ ئامادە بوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی لەسەر بکە من قەرزەکەی دەدەمەوە، ئەوەبوو پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی لەسەر کرد.

پەند و وانە:

زۆر پێویستە هەوڵ بدەین خۆمان لە قەرزاری بپارێزین، تا تەواو ناچار نەبین قەرز لە هیچ کەس نەکەین، هەروەها ئەگەر قەرزمان کرد هەوڵ بدەین زۆر زوو قەرزەکە بدەینەوە بە خاوەنەکەی.

(سلمة) دوای وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) ژیا و یەکێک بوو لەوانەی لە (مدینة) فەتوای دەدا، چونکە یەکێک بوو لە زانا گەورەکانی ناو هاوەڵان.

لە سەردەمی خیلافەتی (علي بن أبو طاليب) دا چوو بۆ دەرەوەی (مدينة) و لەوێ ژیا، دوای ماوەیەک گەڕایەوە بۆ (مدينة) چەند شەوێک تێپەڕی نەکرد (سلمة) کۆچی دوایی کرد.

**پرسیار:**

١- یەکەم بەشداری (سلمة) لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) کەی بوو؟

٢- لە پێشبڕکێکەی (سلمة) و هاوەڵە پشتیوانییەکەدا کێ براوە بوو؟

٣- بۆچی پێغەمبەر (ﷺ) سەرەتا ئامادە نەبوو نوێژ بکات لەسەر یەکێک لە تەرمەکان؟

٤- دوای وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) (سلمة) لە (مدينة) چی دەکرد؟

٥- چ پەند و وانەیەک لە ژیانی ئەم هاوەڵەوە فێر بوویت؟

## ٢١-(عائشة بنت أبوبكر) (رضي الله عنها)

ئەم هاوەڵەی باسی دەکەین تەنها هاوەڵێک نییە و بەس، بەڵکو دایکی باوەڕداران و خۆشەویستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و زاناترین ئافرەتی ناو موسڵمانانە، ئەویش (عائشة بنت أبوبكر)ە، خوا لە خۆی و باوکیشی ڕازی بێت.

(عائشة) لە (مكة) لە دایکبوو و تەمەنی لە (فاطمة)ی کچی پێغەمبەر (ﷺ) کەمتر بوو، دواتر کە (أبوبكر)ی باوکی و پێغەمبەر (ﷺ) کۆچیان کرد بۆ (مدينة)، (عائشة)ش لەگەڵ (فاطمة)ی کچی پێغەمبەردا (ﷺ) کۆچی کرد بۆ (مدينة).

هاوسەرگیری پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ (عائشة) پێش کۆچی پێغەمبەر (ﷺ) بوو بۆ (مدينة)، نزیکەی دوو ساڵ پێش هیجرەت بوو کە(عائشة)ی مارە کرد، بەڵام گواستنەوەکەی، کەوتە نزیکەی دوو ساڵ دوای کۆچکردنی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ (مدينة).

ئیتر (عائشة) بەردەوام پێغەمبەری خوای (ﷺ) دەبینی و پێغەمبەریش (ﷺ) زۆری خۆشدەویست. (عائشة) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) زانیاری زۆر فێر دەبوو.

سێ ساڵ تێپەڕ بووبوو بەسەر ژیانی هاوسەرگیری پێغەمبەر (ﷺ) و (عائشة)دا، پێغەمبەر (ﷺ) بۆ غەزایەک دەرچوو وە (عائشة)شی لەگەڵ خۆی برد. (عائشة) چوو تا دەستنوێژێک بگرێت، کەچی گەردنبەندەکەی ون کرد، دوایی گەڕایەوە تا بیدۆزێتەوە، بەڵام موسڵمانان ئەویان بیر چوو و ڕۆیشتن و نەیانزانی دواکەوتووە. دوایی یەکێک لە موسڵمانەکان بە ناوی (صفوان) لە دواوە بوو، هات و (عائشة)ی بینی و سواری وشترەکەی کرد و خۆی بە پیادە دەرۆیشت، تا گەیاندیەوە بە پێغەمبەر (ﷺ)، کەچی دووڕووەکان ئەمەیان بە دەرفەت زانی و بوختانێکیان بۆ کرد. وتیان:(عائشة) و (صفوان) پێکەوە تاوانیان ئەنجام داوە و تۆمەتی داوێن پیسییان دایە پاڵ (عائشة). پێغەمبەریش (ﷺ) یەکسەر بڕیاری نەدا، بەڵکو کەوتە لێکۆڵینەوە لە ڕووداوەکە. ئیتر لەو ماوەدا (عائشة) زۆر خەفەتی دەخوارد، دووڕووەکانیش لە هەموو شوێنێکی (مدینة)دا باسی ئەو مەسەلەیان دەکرد. تا ئەوەی توانییان هەندێک موسڵمانیش هەڵخەڵەتێنن و وا تێیان بگەیەنن کە (عائشة) داوێن پیسی کردووە، ماوەیەکی زۆر تێپەڕی، تا دواجار خوای گەورە

ئایەتی دابەزاندە خوارەوە و بەرگری کرد لە (عائشة) و دووڕووەکانی بە درۆ خستەوە و سزای دانا بۆ هەموو ئەوانەی بەشداری ئەو درۆ و تۆمەتە بوون، بەو جۆرە خوای گەورە (عائشة)ی ڕزگار کرد و نەیهێشت درۆزنەکان پاکی ئەو ئافرەتە لەکەدار بکەن.

**پەند و وانە:**

دەبێت زۆر وریا بین هەڵنەخەڵەتێین بە درۆ و تۆمەتی ناحەزان و هەر مەسەلەیەک هاتەڕێمان خۆڕاگر بین و بە وردی لێکۆڵینەوەی لێ بکەین، تا ڕاستیەکەمان بۆ دەربکەوێت، ئینجا دوای ئەوە قسەی تێدا بکەین، یان هەر هەنگاوێ بنێین.

(عائشة)ی دایکی باوەڕداران دەڵێت: جارێک (أبوبکر) هاتە ژوورەوە بۆ لام و دوو کچۆڵەم لا بوون کە دەفیان لێدەدا، پێغەمبەریش (ﷺ) خۆی داپۆشیبوو، (أبوبکر) هەڵشاخی پیایاندا، پێغەمبەر (ﷺ) جلەکانی لەسەر دەموچاوی لابرد و فەرمووی: (وازیان لێ بێنە ئەی (أبوبکر)، چونکە ئەم ڕۆژانە ڕۆژانی جەژنن).

(عائشة) دەڵێت: جارێک لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) پێشبڕکێمان کرد، من لێم بردەوە، دوای ماوەیەک قەڵەو بووم، دووبارە پێشبڕکێمان کرد و پێغەمبەر (ﷺ) لێی بردمەوە و

فەرمووی: ئەمەیان لەبری ئەوی تر.

لە حەجی ماڵئاواییدا کە (عائشة)ش هاودەم بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) چوو و (عبدالرحمن)ی برای (عائشة)ش بەشدار بوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد بە (عبدالرحمن) تا (عائشة) ببات تاوەکو عومرەکەی بکات و دواتر بگەڕێتەوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ).

(عمرو بن العاص) دەڵێت: پرسیار کرا لە پێغەمبەر (ﷺ) کێ زۆر لات خۆشەویستە؟

فەرمووی: (عائشة).

وتیان: ئەی لە پیاوان؟

فەرمووی: (أبوبکر).

وتیان: دواتر.

فەرمووی: (عمر).

وتیان: دواتر.

فەرمووی: (أبو عبیدة بن الجراح).

(عائشة) دەڵێت: جارێک پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئایا بەوە ڕازی نیت هاوسەری دنیا و ئاخیرەتیشم بیت؟) وتم: بەرێ وەڵا، فەرمووی: (دەی تۆ هاوسەری دنیا و ئاخیرەتی منیت).

(عائشة) دەڵێت: کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) نەخۆش کەوت و ئازاری زیادی کرد، مۆڵەتی لە هاوسەرەکانی تری خواست، تا لە

ماڵی من بمێنێتەوە، بۆیە هات و لەوێ مایەوە.

کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) نەخۆش بوو و لە ماڵی (عائشة) بوو. (عبدالرحمن)ی برای (عائشة) چوو بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و سیواکی پێ بوو دەیهێنا بە دانیدا. پێغەمبەر (ﷺ) تەماشایەکی سیواکەکەی کرد، (عائشة) سیواکەکەی لە (عبدالرحمن) وەرگرت و پاک شۆردی و و دواتر دای بە پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەریش (ﷺ) سیواکەکەی بەکارهێنا.

(عائشة) دەڵێت: (فاطمة) هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) کە دەچوو بەڕێدا دەتوت هەمان ڕێکردنی پێغەمبەرە(ﷺ). پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: مەرحەبا لە کچەکەم، ئینجا لای خۆیەوە داینیشاند، دواتر چپەیەکی بۆ کرد و (فاطمة) گریا، وتم: بۆچی دەگریت؟ دواتر پێغەمبەر (ﷺ) چپەیەکی تری بۆ کرد و (فاطمة) زەردەخەنەیەکی کرد، منیش وتم: تا ئێستا نەمدیوە گریان و پێکەنین ئاوا بە یەکەوە بن. دواتر کە پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد، چووم لە (فاطمة)م پرسی. ئەویش وتی: یەکەمجار چپاندی بە گوێمدا (جبریل) هەموو ساڵێک یەک جار قورئانی لەگەڵ دەور دەکردمەوە، ئەمساڵ دوو جار لەگەڵم دەوری کردەوە، وادەزانم ئەمە ئاماژەی مردنمە، تۆیش یەکەم کەسیت بە من دەگەیتەوە)، منیش دەستم کرد بە گریان. دواتر

فەرمووی: (ئایا ڕازی نابیت تۆ گەورەی ژنانی بەهەشت بیت؟) منیش لە خۆشیدا بەوە پێکەنیم.

دوای وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) (أبوبكر الصديق)بوو بە خەلیفە و (عائشة)ش لەو ماوەدا لە (مدينة) مایەوە و ڕێنمایی و زانستی پێشکەش بە موسڵمانان دەکرد، دوای وەفاتی (أبوبكر)، (عمر بن الخطاب)بوو بە خەلیفە و (عائشة) لەو سەردەمەشدا هەمان شێوەی پێشووتر سەرقاڵی بەخشینەوەی زانست بوو.

کاتێک (عمر بن الخطاب)پێکرا، بە (عبدالله)ی کوڕی وت: بڕۆ بۆ لای (عائشة) و پرسیاری لێ بکە بزانە مۆڵەت دەدات لە لای پێغەمبەر (ﷺ) و (أبوبكر) ئەسپەردە بکرێم؟

(عائشة)ش وتی: من ئەوەم بۆ خۆم دانابوو، بەڵام ئەمڕۆ لە خۆم دەگوزەرم بۆ (عمر). کە (عبدالله) هاتەوە (عمر) وتی: چیت کرد؟ ئەویش وتی: مۆڵەتی دا. (عمر) وتی: هیچ شتێک هێندەی ئەو شوێنە لام گرنگ نییە، جا کەمردم بمبەن بۆ ئەوێ و دواتر سەلام بکەن. دواتر هەمدی بڵێ، (عمر بن الخطاب)داوای مۆڵەت دەکات، ئەگەر (عائشة) هەمدی مۆڵەتی دا ئەوکات ئەسپەردەم بکەن، ئەگەریش دەرفەتی نەدا بمگێڕنەوە و بمبەن بۆ گۆڕستانی موسڵمانان.

کاتێک (عثمان بن عفان) شەهید کرا، دایکە (عائشة) زۆر

خەفەتی بەوە خوارد و بەڵێنی دا تۆڵە لە بکوژانی بکاتەوە، بۆیە لەگەڵ (زبیر) و (طلحة)دا چوون بەرەو (بصرة)، تا لەوێ سوپا کۆبکەنەوە و بکوژانی (عثمان) لەناوبەرن، خەلیفەی موسڵمانانیش کە(علي بن أبو طاليب) بوو وایزانی لە دژی ئەو کۆبوونەتەوە، بۆیە چوو تا لە مەسەلەکە بکۆڵێتەوە. هەردوولا دانیشتنیان کرد و لەوە تێگەیشتن مەبەستی هەردووکیان لەناوبردنی بکوژەکانی پێشەوا (عثمان)ە، بۆیە بڕیاریان دا بگەڕێنەوە، بەڵام بکوژانی پێشەوا (عثمان) کە بەمەیان زانی وتیان: ئەگەر شتێک نەکەین ئەمانە لەناومان دەبەن، دواجار پیلانیان دانا ببن بە دوو بەشەوە، هەر بەشێکیان بچێتە ناو یەکێک لەو دوو سوپایە و لەوێوە دەست بکەن بە تیر هاویشتن بۆ ئەوەی جەنگ ڕووبدات و ئەمان ڕزگاریان بێت. پیلانەکەشیان سەری گرت و جەنگەکەیان هەڵگیرساند. جەنگێکی قورس ڕوویدا، پێشەوا (علي) هاواری دەکرد دەست هەڵگرن، بەڵام کەس نەیدەبیست. لەولاشەوە دایکە (عائشة) بە سواری وشترێکەوە هات، بەڵام هیچ سوودی نەبوو، دواجار وشترەکەی (عائشة)یان بریندار کرد و دایکە (عائشة) کەوتە خوارەوە.

(علي) فەرمانی کرد خێرا کەژاوەکەی (عائشة) ببەنە دەرەوە و شوێنێکی حەوانەوەیان بۆ دروستکرد، ئینجا (علي) هات بۆ لای (عائشة) و وتی: دایەگیان چۆنیت؟

وتی: باشم.

(علي) وتی: خوا لێت خۆش بێت، ئینجا هەموو پێداویستیەکی بۆ ئامادە کرد بۆ ئەوەی بچێتەوە بۆ (مدینة).

دوای ئەوە دایکە (عائشة) زۆر خەفەتی دەخوارد کە بەشداری ئیشی سیاسی کردووە و بەڵێنی دا ئیتر تەنها سەرقاڵی پەرستش بێت و دەست وەرنەداتە هیچ کارێکی سیاسی.

دواجار لە شەوی حەڤدەی ڕەمەزانی ساڵی پەنجا و هەشتی کۆچیدا وەفاتی کرد و لەسەر وەسییەتی خۆی هەر شەو تەرمەکەی ئەسپەردە کرا. (أبو هريرة) نوێژی لە سەر تەرمەکەی کرد و دواتر تەرمەکەی لە بەقیع ئەسپەردە کرا، تەمەنی شەست و سێ ساڵ و چەند مانگێک بوو.

**پرسیار:**

١- بەسەرهاتی ئەو تۆمەتە چۆن بوو کەبۆ (عائشة) کرا؟

٢- پێشبڕکێکەی (عائشة) و پێغەمبەر (ﷺ) باس بکە.

٣- (عمر بن الخطاب) بۆچی (عبدالله)ی کوڕی نارد بۆ لای (عائشة)؟

٤- کە دایکە (عائشة) کەوتە خوارەوە، پێشەوا (علي) چی کرد؟

٥- لە ژیانی دایکە (عائشة)وە چی فێر بوویت؟

## ٢٢- (سعد بن عبادة)(رضي الله عنه)

ئەم هاوەڵە خۆشەویستەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ناوی (سعد بن عبادة)یە. (سعد) لە پشتیوانانە، واتە: لە (مدینة) دەژیا و ماڵ و ژیانی لەوێ بوو.

کوڕی (دلیمة) لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان، کونییەکەی (أبوثابت)و یان (أبو قیس)ە، دایکی ناوی (عمرة بنت مسعود)ە، و هاوەڵی پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم).

(سعد) کوڕێکی هەبوو بە ناوی (سعید)، کوڕێکی تری ناوی (محمد) بوو، کوڕێکی تری ناوی (عبدالرحمن) بوو. دایکی ئەم سێ کوڕەی غەزیەی کچی (سعد) بوو کە خێزانی (سعد بن عبادة)یە، لە ژنێکی تری کە ناوی (فکهة بنت عبیدة) هەریەک لە (أمامة) و (سدوس)ی هەبوو.

(سعد) یەکێکە لە بەشداربوانی بەیعەتی عەقەبە و یەکێکە لە دوانزە نەقیبەکە، واتە زۆر زوو موسڵمان بوو و ڕۆڵێکی

گەورەی هەبوو لە بڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلام لە (مدینة)دا.

جارێک (سعد) چوو بۆ (مكة) و لەوێ خەڵکی (مكة) (سعد)یان گرت و زۆریان لێدا، هێندەیان لێدا جەستەی تەواو خوێناوی بوو. کابرایەک هات و وتی: ماڵوێران کەس ناناسیت لە (مكة) پەنات بدات؟

ئەویش وتی: نا، بەڵام جاران (عاص بن وائیل) دەهاتە (مدینة) و ئێمەش ڕێزمان لێدەگرت. یەکێک لەوێ بوو کە (عدي بن قیس) بوو، وتی: باسی ئامۆزاکەی منی کردووە، بەخوا یەک کەس نابێت نزیکی بێتەوە، بۆیە وازیان لێهێنا.

کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) هاتە (مدینة)، (سعد) هەموو ڕۆژێک بڕێک گۆشت و تریتی بۆ دەنارد، ئیتر پێغەمبەر (ﷺ) لە ماڵی هەر هاوسەرێکی بوایە، ئەو قاپەی (سعد)ی بۆ دەبرا.

جارێک (سعد بن عبادة) نەخۆش بوو، پێغەمبەر (ﷺ) هاودەم بە (أسامة بن زید) چوو بۆ لای (سعد) و سەردانی کرد، لە ڕێگەدا سەرکردەی دووڕووەکان بە قسەی ناشیرین ئازاری پێغەمبەری خوای دا، پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی بۆ (سعد) باسکرد. (سعد)یش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێی خۆش بەو چاوپۆشی لێ بکە، پێش ئەوەی جەنابت بێیتە (مدینة) خەڵکی ڕێککەوتبوون ئەو بکەن بە سەرگەورەی ئێرە،

بۆیە کە ئێستا ئەوەی لەدەست چووە بۆیە وادەکات.

ساڵێک بوو پێغەمبەر (ﷺ) هاتبوویە (مدینة)، دەرچوونێکی هەبوو و لەو ماوەدا (سعد)ی کرد بە بەرپرسی (مدینة)، تا لەبری خۆی کاروبارەکان بەڕێ بکات.

کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) دەرچوو بۆ غەزای بەدر کەوتە ڕاوێژکردن بە هاوەڵان، کاتێک سەرەی (سعد بن عبادة) هات هەستایە سەرپێ و وتی: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر فەرمانمان پێ بکەیت تاوبدەینە ناو ئەو دەریایە تاو دەدەین، ئەگەر فەرمانمان پێ بکەیت بچینە ناو جەرگەی دەریاوە دەچین.

کاتێک (إبراهیم)ی کوڕی پێغەمبەر (ﷺ) لە سەرەمەرگدا بوو، پێغەمبەر (ﷺ) فرمێسک بە چاوەکانییەوە بوو (سعد) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوە چیە؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەوە ڕەحمەتی خوایە کە خوا خستوویەتیە ناو دڵی بەندەکانییەوە، خوای گەورە ڕەحم بە بەندە بە ڕەحمەکانی دەکات).

**پەند و وانە:**

سۆز و میهرەبانی سیفەتی ناو ناخی موسڵمانە و پێغەمبەری خوایش (ﷺ) لەوەدا پێشەنگ و پێشەوامان بووە، گریان بۆ

لەدەستدانی ئازیزان تاوان نییە، بەڵکو تاوان ئەوەیە دەنگ بەرز بکەیتەوە، یان نارەزایی دەربڕی.

لە ساڵی پێنجەمی کۆچیدا دایکی (سعد) لە سەرمەرگدا بوو و (سعد)یش لە غەزایەکدا بوو. بە دایکیان وت: وەسیەت ناکەیت؟

ئەویش وتی: سامانەکە هەمووی هی (سعد)ە، وەسیەتی چی بکەم؟ کە (سعد) هاتەوە و ئەوەی بیست پرسیاری کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) ئایا خێری بۆ بکات سوودی پێ دەگەیەنێت؟

فەرمووی: بەڵێ.

(سعد) وتی: دەی فڵانە باخ دەکەم بە خێر بۆی.

(سعد) لە غەزای خەندەقیشدا بەشدار بوو و پێغەمبەر (ﷺ) ئەوی هاودەم بە (سعد بن معاذ) نارد، تا هەواڵی جوولەکەکانی بەنی قورەیزەی بۆ وەربگرن، ئەوانیش هەواڵیان هێنایەوە کە ئەوانە ناپاکییان نواندووە.

(سعد) بەرانبەر بە هەژاران زۆر چاکەکار بوو و ڕۆژانە ژمارەیەکی زۆر لەوانی دەبردەوە بۆماڵەوە، تا لەوێ نان بخۆن.

(سعد) لە هەموو غەزا و کاتەکانی تردا لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ) بوو و هەر چاکەیەک بوایە، نەیدەهێشت لێی بێبەش بێت و خۆی پێ دەگەیاند.

دوای وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) (سعد) چوو لە شاری

(دمشق) نیشتەجێ بوو، دواتر چوو بۆ شاری (حران) و لەوێ کۆچی دوایی کرد.

**پرسیار:**

١- (سعد) لە (مکة) چۆن ئازار درا؟
٢- کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) ڕاوێژی کرد بە (سعد)، ئەو چی وت؟
٣- باسی مردنی دایکی بکە.
٤- (سعد) لە غەزای خەندەقدا چ ئەرکێکی پێ سپێردرا؟
٥- پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕووداوی مردنی (إبراهیم)ی کوڕیدا چی فەرموو؟

## ٢٣- (سلمان الفارسي)

(سلمان الفارسي) ئەو هاوەڵە ئازیز و خۆشەویستەی پێغەمبەری خوایەکە لە وڵاتی (إیران)وە بەدوای ڕاستیدا گەڕا و کەسوکاری خۆی بەجێهێشت لە پێناو ڕەزامەندی خوادا، تا گەیشت بە پێغەمبەر(ﷺ) و باوەڕی پێ هێنا. پێغەمبەریش هێندەی خۆش دەویست فەرمووی: (سلمان) لە ئێمەی ئالوبەیتە) (سلمان) منا أهل البیت)، (سلمان)یش هێندە ئیسلامی لا خۆشەویست بوو دەیوت: من کوڕی ئیسلامم.

(سلمان) منداڵێک بوو لە ناوچەی (أصفهان) لە گوندێک کە پێی دەوترا (جەی). منداڵێکی خوێن گەرم و ئێسک سووک بوو، باوکی (سلمان) کەسێکی ناودار و زۆر ناسراوی ناوچەکەی بوو، زۆر (سلمان)ی خۆشدەویست و هیچکات لە خۆی دووری نەدەخستەوە.

لەو ناوچانەی کە (سلمان)ی تێدا دەژیا خەڵکی لە جیاتی خوا ئاگریان دەپەرست، (سلمان)یش لەگەڵ باوکیدا دەچوو بۆ

پەرستگای ئاگر و لەوێ وەک ئەوان بە بێباوەڕی دەژیا، تا ئەوەی سەرقاڵ دەبوو بە سەرپەرشتی ئاگری ناو پەرستگاکەوە، باوکیشی زۆر دڵخۆش دەبوو کە کوڕەکەی بەوجۆرە لەسەر ئەو ئایینەیە و هەمیشە لەگەڵ خۆیەتی.

## پەند و ئامۆژگاری

دەبێت سوپاسی خوا بکەین کە ئێمە وەک (سلمان) لەناو بێباوەڕاندا لەدایک نەبووین و خوای گەورە دایک و باوک و کەسوکاری باوەڕداری پێ بەخشیوین، ئەگەر نا ئێمەش تووشی تاوان دەبووین.

باوکی (سلمان) سەرقاڵی ئیشی باخ و کشتوکاڵیش دەبوو، هەموو جارێک (سلمان)ی لە ماڵدا دەنا و خۆی دەچوو بۆ ئیشکردن لە باخەکە. ڕۆژێکیان ئیشی هەبوو بۆیە (سلمان)ی نارد بۆ ئیشێک. (سلمان)یش چوو و لە ڕێگەدا دای بە پاڵ کڵێسایەکی مەسیحیەکاندا، سەیری کرد ئەوان نوێژ دەکەن، (سلمان) زۆر سەرسام بوو بەوە، چونکە ئەوە یەکەمجاری بوو ئەو کەسانە و ئەو ئایینە ببینێت، بۆیە چوو بۆ لایان و تا ئێوارە

لەلایان مایەوە.

پرسیار: ئایا ئایینی مەسیحیەت ئایینێکی ڕاستە؟

وەڵام: بەڵێ، ئایینی مەسیحیەت ئایینێکی ڕاستە و خوا ناردوویەتی بۆ پێغەمبەر عیسا (علیە السلام)، بەڵام کاتێک ئایینی ئیسلام هات ئیتر نابێت هیچ کەس مەسیحی بێت و هەموو کەس، دەبێت بێنە ناو ئیسلام، ئەگەر هەرکەسێک ئەمڕۆ ببێت بە مەسیحی ئەوە لە فەرمانی خوا دەرچووە و دەچێتە دۆزەخ، چونکە مەسیحیەکانی ئەمڕۆ دەڵێن: سێ خوا هەیە و (عیسی) کوڕی خوایە کەئەوەش کوفرە، چونکە مەسیحیەت لە سەردەمی (سلمان)دا بڕوای بە خوای تاک و تەنها هەبوو.

(سلمان) پرسیاری کرد وتی: لەکوێ بە چاکی دەتوانم لە مەسیحیەت تێبگەم؟

وتیان: دەبێت بچیت بۆ (شام).

(سلمان)یش گەڕایەوە بۆ ماڵەوە. بەڵام باوکی ترسا بوو کە کوڕەکەی نەهاتۆتەوە و خەڵکی ناردبوو بە شوێنیدا و خۆیشی دەستی لە ئیش هەڵگرتبوو و بەدوای (سلمان)دا دەگەڕا.

کاتێک (سلمان) چوویەوە ماڵەوە بە باوکی وت: کە ئەو خەڵکەی بینیوە و وتی: تا ئێوارە لای ئەوان بووە. باوکیشی وتی: ڕۆڵەکەم ئایینەکەی ئەوان هەڵەیە ئایینەکەی خۆت

باشترە. بەڵام (سلمان) وتی: نا، بەخوا ئایینەکەی ئەوان باشترە. باوکیشی کە ئەوەی بیست ترسا و (سلمان)ی لە ماڵەوە بەند کرد، تا نەچێتە دەرەوە.

(سلمان) بە کەسێکدا هەواڵی نارد بۆ مەسیحیەکان و وتی: هەرکات چوون بۆ (شام) منیش لەگەڵتاندا دێم، ئەوانیش پێیان وت: چەند ڕۆژێکی تر دەچن.

کاتێک ویستیان بچن (سلمان)یش لەماڵ دەرچوو و چوو بۆلایان و لە پێناو ناسینی خوای تاک و تەنهادا ماڵ و وڵات و کەسوکاری خۆی بەجێهێشت.

کە چوو بۆ (شام) وتی: چاکترین و خواناسترین کەس کێیە؟

ئەوانیش وتیان: فڵانە کەسە. (سلمان)یش چوو بۆ لای و وتی: من حەز دەکەم ببم بە مەسیحی و خزمەتی تۆ دەکەم تۆیش خوام پێ بناسێنە.

**پەند و ئامۆژگاری**

ڕەزامەندی خوای گەورە و بە گوێکردنی خوا زۆر گرنگترە لە کەسوکار و شوێن و مادده و هەرشتێکی تر وەک چۆن (سلمان) لە پێناو ناسینی خوادا وازی هێنا لە هەموو شتێک.

(سلمان) لای ئەو کەسە مایەوە و فێری خواپەرستی دەبوو و خزمەتی ئەو زانایەی دەکرد، کەچی سەیری کرد ئەو کەسە کاتێک پارەی خێر دێنن بۆ لای پارەکە دەبات بۆ خۆی، بۆیە ڕقی بوو لەو کەسە، تا ئەوەی ئەو کەسە مرد و مەسیحیەکان کۆبوونەوە و تەرمەکەیان ئەسپەردە کرد.

پرسیار: ئەی (سلمان) چی کرد؟

وەڵام: (سلمان) نەیتوانی ڕاستیەکان بشارێتەوە و بە خەڵکەکەی، وت ئەو پیاوە دز و خراپەکار بووە و بە خەڵکەکەی وت پارەکەی، ئەو کەسە لە کوێدایە، بۆیە ئەوانیش چوون و پارەکەیان هێناو دابەشیانکرد بەسەر خەڵکدا.

ئینجا (سلمان) لەلای زانایەکی تری مەسیحی مایەوە، سەیری کرد ئەم زانایە زۆر خواناس و باوەڕدارو چاکەکارە. بەردەوام لەلای بوو، تا کاتێک سەرەمەرگی هات، لە سەرەمەرگیدا بە (سلمان)ی وت تەنها یەک کەس، دەناسم بەڕاستی لەسەر ئایینی خوا مابێتەوە، ئەویش لە شاری (موصل) بڕۆ بۆ لای ئەو.

ئینجا ئەو زانایە مرد و (سلمان)یش چوو بۆ لای ئەو زانایە لە (موصل) و وتی: من لای زاناکەی شام بووم ئەویش پێش مردنی منی نارد بۆ لای تۆ.

**پەند و ئامۆژگاری**

لە ڕێگەی ناسینی خو او ڕەزامەندی خوادا نابێ ماندوو ببین و، دەبێت هەرگیز وازنەهێنین، هەروەها نابێ مردنی زانا و کەسەکان ببنە هۆکاری ساردبوونەوەمان لە ئایینی خوا.

(سلمان) لای ئەو زانایەی (موصل) مایەوە و سەیری کرد کەسێکی زۆر خواناس و چاکەکارە، بەڵام هێندەی نەبرد ئەویش سەرەمەرگی هات و بە (سلمان)ی وت: بڕۆ بۆ لای فڵانە زانا کە لە (نسیبین)ە.

ئینجا ئەو زانایەی موسڵیش مرد و (سلمان)یش چوو بۆ لای ئەو زانایەی (نسیبین) و لای ئەویش مایەوە و سەیری کرد کەسێکی زۆر چاک و خواناسە، بەڵام ئەویش سەرەمەرگی هات. (سلمان) وتی: بچم بۆلای کێ؟ ئەویش وتی: بڕۆ بۆ لای کەسێک کە لە (عموریە) دادەنیشێت.

(سلمان)یش چوو بۆ لای ئەو کەسە و سەیری کرد، ئەویش زانایەکی خواناسە، لای ئەویش مایەوە، تا سەرەمەرگی هات.

ئەوکات (سلمان) وتی: دەبێت بچم بۆ لای کێ؟

ئەویش وتی: کەس ناناسم بە تەواوی لەسەر ئایینی ڕاستی خوا مابێت، بەڵام بەم نزیکانە خوای گەورە کۆتا پێغەمبەری خۆی دەنێرێت لە خاکی عەرەب لە وڵاتی (مكة) و (مدينة) بڕۆ بۆ ئەوێ هەرکات هات باوەڕی پێ بهێنە.

**پەند و ئامۆژگاری**

١-هەموو کەسێک دەبێت بمرێت وەک چۆن ئەو زانایانەی (سلمان) چوو بۆ لایان دەمردن، بەڵام کەسی چاک ئەوەیە بە خواناسیەوە بمرێت.

٢-دەبێت لەگەڵ ئەوەی مامۆستایەکمان مرد، یان دوورکەوتەوە لێمان خێرا مامۆستایەکی تر پەیدا بکەین، تا فێری پەیامی خوا و زانستمان بکات.

(سلمان) چەند ناونیشانێکی لەو زانایە وەرگرت و بڕیاریدا بچێت بۆ (مكة) و (مدينة) تا چاوەڕێی هاتنی کۆتا پێغەمبەری خوا بێت، لەگەڵ کاروانێکی بازرگانیدا ڕێککەوت و وتی: چی پارەم هەیە دەیدەم بە ئێوە، بەڵام لەگەڵ خۆتاندا بمبەن بۆ (مكة) و (مدينة).

ئەوانیش ڕازی بوون، بەڵام کە بردیان بۆ ئەوێ ستەمیان لێ کرد و وەک کۆیلە فرۆشتیان بە کەسێکی جولەکە. (سلمان)یش وەک کۆیلە لای ئەو کابرا جولەکەیە مایەوە و ئیشی بۆ دەکرد و چاوەڕێ بوو پێغەمبەری خوا بێت.

ڕۆژێکیان ئامۆزایەکی ئەو کابرا جوولەکەیە هات و (سلمان)ی لێ کڕی و لەگەڵ خۆیدا بردی بۆ (مدينة)،

(سلمان) کە (مدینة)ی بینی زانی پێغەمبەری خوا لەوێدا دەبێت.

هێندەی نەبرد هەواڵێک هات وتیان: لە (مكة) کەسێک بە ناوی (محمد) دەرکەوتووە دەڵێت: پێغەمبەری خوام، (سلمان)یش لە خۆشیدا خەریک بوو بکەوێت و بە پەلە پرسیاری لێکرد چیت وت؟ بەڵام، خاوەنەکەی لێی تووڕە بوو و وتی: بڕۆ ئیشی خۆت بکە.

دواتر پێغەمبەر(ﷺ) کە هاتبوو بۆ قوبا (سلمان) بڕێ خواردنی برد و چوو بۆ لای و وتی: بیستوومە تۆ کەسێکی چاکیت، ئینجا ئەو نیشانانەی تاقیکردەوە کە زانا مەسیحیەکە پێی وتبوو، ئەوکات زانی ئەوە پێغەمبەری خوایە، بۆیە خێرا موسڵمان بوو و باوەشی کرد بە پێغەمبەردا(ﷺ) و دەگریا.

ئینجا (سلمان) بەسەرهاتی خۆی گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەریش(ﷺ) بەو ڕووداوەی سەرسام بوو و داوای کرد بیگێڕێتەوە بۆ هاوەڵان، ئەوانیش گوێیان لە بەسەرهاتەکەی گرت.

ئینجا (سلمان) چوویەوە بۆ لای خاوەنەکەی و وتی: دەمەوێت خۆم بکڕمەوە. کابراش داوای سامانێکی زۆری کرد. پێغەمبەر(ﷺ) بە هاوەڵانی فەرموو: یارمەتی براکەتان بدەن، هاوەڵانیش یارمەتییان دا و (سلمان) خۆی کڕیەوە و ئازاد بوو.

**پەند و ئامۆژگاری**

١- کە ڕووداوێکی جوان و چاکمان لابوو، یان بیستمان، دەبێت بیگێڕینەوە بۆ کەس و هاوڕێ چاکەکانمان وەک چۆن (سلمان) بەسەرهاتی خۆی گێڕایەوە.

٢- دەبێت بە هەموو جۆرێک یارمەتی خوشک و برا مسوڵمانەکانمان بدەین و هەوڵ بدەین لە سەختی ڕزگاریان بکەین وەک چۆن هاوەڵان هەموو پێکەوە یارمەتی (سلمان الفارسي)یان دا.

هاوەڵان مشتومڕیان بوو لەسەر (سلمان) و هەریەکە و دەیوت: (سلمان) لە ئێمەیە. بەڵام پێغەمبەر فەرمووی: (سلمان) لە ئێمەی ئالوبەیتە، ئیتر هەمیشە (سلمان) لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بوو و زانستی وەردەگرت و لە مزگەوت دەژیا. زانستی لە پێغەمبەر وەردەگرت و بەشداری هەموو غەزا و جەنگەکانی دەکرد.

لە جەنگی خەندەقدا کە بێباوەڕان هاتن بەرەو (مدینة)، تا بدەن لە موسڵمانان و لە ناویان ببەن پێغەمبەر(ﷺ) ڕاوێژی کرد بە موسڵمانان، تاکو بزانن چی بکەن، (سلمان) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، با بەدەوری شارەکەدا چاڵێکی گەورە

هەڵبکەنین ئیتر بێباوەڕان ناتوانن بێنە ناو شارەکەوە.

پێغەمبەریش(ﷺ) قسەکەی وەرگرت، بەوە بێباوەڕەکان نەیانتوانی بێنە ناو شارەکە و خوا بێباوەڕەکانی شکاند.

ڕۆژێکیان (سلمان) و (بلال) و (صهیب) تووڕە بوون لە (أبو سفيان) کە ئەوکات هێشتا موسڵمان نەبوو بوو، پێشەوا (أبوبكر) پێی وتن: چۆن وا دەڵێن: بە گەورەی قوڕەیش؟ دواتر (أبوبكر) هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەی (أبوبكر) لەوانەیە ئەو سیانەت تووڕە کردبن، ئەگەر تووڕەت کردبن ئەوا پەروەردگارت تووڕە کردووە).

خێرا (أبوبكر) چوویەوە بۆ لایان و وتی: برا ئازیزەکانم ئایا من ئێوەم تووڕە کردووە؟ وتیان: نا ئەی (أبوبكر) خوا لێت خۆش بێت.

(سلمان الفارسي) هەمیشە هاوەڵانی بێدار دەکردەوە لەوەی ستەم نەکەن و لە نێو خەڵکدا دادپەروەر بن، زۆر لەخواترس بوو نوێژ و پەرستش و گریانی لەبەر خوای گەورە زۆربوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی کات بە قسە و هەڵسوکەوتە جوانەکانی دڵی هاوەڵانی خۆشدەکرد و دەیخستنە پێکەنین.

هەروەها (سلمان) زۆر خاکی بوو، زۆر جار بە تەنها لە ژێر سێبەری درەختێکدا دەخەوت و نانی سادەی دەخوارد و زۆر

ڕێزی خەڵکی دەگرت.

(سلمان) بەوجۆرە دەژیا، تا ئەو کاتەی پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کرد، (سلمان) زۆر دڵگران و بێتاقەت بوو و هەرگیز ئەوەی لەبیر نەدەچوو، بەڵام هەمیشە لەسەر ئاینی ئیسلام بەردەوام بوو و بەشداری غەزای دەکرد و لە ئازادکردنی وڵاتی فارس و گەیاندنی ئیسلام بە (إیران)دا بەشداری کرد و بەردەوام خزمەتی دەکرد بە ئایینی خوا، تا ئەوەی سەرەمەرگ هات و لەدوای تەمەنێکی زۆر لە سەردەمی خیلافەتی پێشەوا (عثمان بن عفان)دا کۆچی دوایی کرد.

**پەند و ئامۆژگاری**

نابێ مردنی کەسە گەورە و زاناکان ببنە هۆکاری ساردبوونەوەمان لە خزمەتکردن بە ئایینی خوا، بەڵکو دەبێت، هەتا دوا ساتی ژیانمان خزمەت بکەین بە ئایینی خوا.

**پرسیارەکان:**

١-(سلمان) لەکوێ دەژیا و باوکی سەرقاڵی چی بوو؟

٢-ئایینی مەسیحیەت چییە؟ ئایا درووستە ئێمە ببین بە مەسیحی؟

٣-(سلمان) تا گەیشت بە پێغەمبەر(ﷺ) پێشتر بۆ چەند شوێن چوو؟

٤-(سلمان) چۆن خۆی ئازاد کرد؟

٥-نەخشەکەی (سلمان) لە جەنگی خەندەقدا چی بوو؟

٦-بەسەرهاتەکەی (سلمان) لەگەڵ پێشەوا (أبوبكر) باس بکە؟

٧-، ئەگەر ئێستا (سلمان الفارسي) لەلاتدا بوایە، چیت پێ دەوت؟

## -٢٤ (أبو هريرة) (رضي الله عنه)

یەکێکی تر لە هاوەڵانی خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) (أبو هريرة) بوو کە پێغەمبەریش (ﷺ) زۆر ئەوی خۆشدەویست و نزای بۆ خۆی و دایکیشی کردوە. (أبو هريرة) لە بنەڕەتدا ناوی (عبدالرحمن بن صخر) بوو.

(أبو هريرة) (یمن)ی بوو، لە سەردەمی نەزانی و بێباوەڕیدا ناویان نابوو (عبد شمس) واتە: بەندەی خۆر، ئەو ناوەشی هەر مایەوە، تا موسڵمان بوو. ئەوکات پێغەمبەر(ﷺ) ناوەکەی گۆڕی و ناوی نا (عبدالله) و بە (أبو هريرة)یش بانگی دەکرد.

(أبو هريرة) لە (یمن) لەگەڵ دایک و باوکیدا بوو و لەوێ هەر لە منداڵییەوە کەسێکی گورج و گۆڵ بوو و ئیشی دەکرد.

هێندەی نەبرد باوکی کۆچی دوایی کرد، ئیتر هێندەی تر ژیانیان سەخت بوو، بە هەژاری و نەداری لەگەڵ دایکیدا دەژیان.

(أبو هريرة) ئیشی شوانیی دەکرد و دەچوو مەڕی دەلەوەڕاند

بۆ خەڵک، تا بتوانێت بەوە بژێوی خۆی و دایکی دابین بکات.

پرسیار: بۆچی پێی دەوترێت (أبو هريرة) واتە: (باوکی پشیلە بچووکەکە)؟

وەڵام: چونکە کاتێک کە (أبو هريرة) لەناو هۆزەکەی خۆیدا شوانی دەکرد پشیلەیەکی بچووکی هەبوو دەیبرد لەگەڵ خۆیدا و یاری لەگەڵ دەکرد و هەمیشە ئەو پشیلەیەی لەلای خۆی دەپاراست و لای خۆیشیدا دەیخەواند.

بەوجۆرە (أبو هريرة) لەگەڵ دایکی ژیانی بەسەر دەبرد، تا لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) موسڵمان بوو و باوەڕی پێ هێنا. ئەمەش کاتێک لەگەڵ دایکیدا کۆچی کرد بۆ (مدينة)، بەڵام دایکی هەر بە بێباوەڕی مابوویەوە.

(أبو هريرة) هەمیشە ئاواتی ئەوە بوو دایکی موسڵمان بێت و نزای بۆ دەکرد، هەرچەندە دایکی لەسەر موسڵمان بوونی لێی توڕە دەبوو، بەڵام (أبو هريرة) لەگەڵیدا نەرم و نیان بوو و چاکەی لەگەڵ دەکرد و نزای خێری بۆ دەکرد.

**پەند و ئامۆژگاری**

١-دەبێت ناوی جوان بنێین لە منداڵ، ئەگەریش ناوی ناشرین و خراپ بوو خێرا ناوەکەی بگۆڕین وەک چۆن پێغەمبەر(ﷺ) ناوی (أبو هريرة)ی گۆڕی.

٢-نابێ لەبەردەم سەختیەکانی ژیاندا چۆک دابدەین وەک چۆن (أبو هريرة) لەگەڵ هەژاری و مردنی باوکیشیدا دەستبەردار نەبوو و کاری شوانی دەکرد.

٣-هەرچەندە دایک و باوکمان لەگەڵماندا توندبن، نابێت بەرانبەریان خراپە بکەین و دەبێت لەگەڵیاندا چاک بین و ڕێزیان بگرین و هەمیشە نزای خێریان بۆ بکەین.

(أبو هريرة) زیاتر لە مزگەوتدا دەژیا و زۆربەی کاتەکانیشی لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) بوو و فەرموودەی لێ وەردەگرت و لەبەری دەکردن، هەرچەندە توانای نووسینی نەبوو، بەڵام بە چاکی فەرموودەکانی لەبەر دەکردن و بۆ خەڵکی دەگێڕانەوە.

جارێکیان (أبو هريرة) هەستی کرد هەندێکجار فەرموودەی بیر دەچێتەوە، بۆیە چوویە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من فەرموودەی زۆرت لێ دەبیستم و هەندێکیانم بیر دەچێتەوە.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: عەباکەت بڵاوبکەرەوە، ئەویش عەباکەی ڕاخست، پێغەمبەر(ﷺ) دەستی بەسەردا هێنا و دواتر فەرمووی: هەڵیگرەوە

ئەویش هەڵی گرت، ئیتر دوای ئەوە هەرگیز فەرموودەی لەبیر نەدەچوو.

(أبو هريرة) لە هەموو هاوەڵان زیاتر فەرموودەی لە پێغەمبەر(ﷺ) دەگێڕایەوە هەرچەندە زۆر کەم لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) ژیا، چونکە تەنها چوار ساڵ لەگەڵیدا ژیا.

ئەوەبوو دوای چوار ساڵەکە پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کرد، بەڵام لەو ماوەدا (أبو هريرة) هیچ دەرفەتێکی لەدەست نەدەدا و هەمیشە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بوو و لەو پێناوەشدا هەموو ناڕەحەتیەکی دەبینی.

ڕۆژێکیان (أبو هريرة) زۆر برسی بوو، لە برساندا لە سەرە ڕێگەدا ڕاکشابوو، پێشەوا (أبوبكر) هات و دای بەلایدا، (أبو هريرة) پرسیارێکی لێکرد بەو هیوایەی پێشەوا (أبوبكر) پێی بڵێ، وەرە، با بڕۆینەوە بۆ ماڵەوە.

بەڵام پێشەوا (أبوبكر) نەیزانی مەبەستی ئەوەیە، بۆیە وەڵامی پرسیارەکەی دایەوە و چوو.

ئینجا پێشەوا (عمر) هات و دای بەلایدا بەهەمان شێوە ئەویش چوو.

دواتر پێغەمبەر(ﷺ) هات و دای بەلایدا کە (أبو هريرة)ی بینی زانی زۆر برسیەتی، بۆیە هەڵیساندە سەر پێ و بردیەوە بۆ ماڵەوەی خۆیان، سەیری کرد قاپێ شیر لە ماڵیاندا هەیە بە (أبو هريرة)ی فەرموو: بڕۆ هاوەڵانی صوففە بانگ بکە.

پرسیار: هاوەڵانی صوففە کێ بوون؟

وەڵام: ئەوانە بوون کە هەژار بوون و لەناو مزگەوتدا دەژیان و بەردەوام زانستیان وەردەگرت و خواردنیان لەلایەن موسڵمانانی ترەوە دابین دەکرا.

(أبو هريرة) چوو بۆ مزگەوت و ئەو هاوەڵانەی بانگ کردن، ئەوانیش چوون بۆ ماڵی پێغەمبەر(ﷺ) لەوێ پێغەمبەر(ﷺ) یەک یەک تێر شیری پێدان، ئینجا هەموویان چوونەوە.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی (أبو هريرة) ئێستا من و تۆ ماوینەتەوە. وتی: بەڵێ، پێغەمبەری(ﷺ) بزەیەکی کرد و فەرمووی: بخۆرەوە، ئینجا شیرەکەی پێدا.

(أبو هريرة)ش خواردیەوە، پێغەمبەر(ﷺ)دووبارە پێدا، ئەویش خواردیەوە، پێغەمبەر(ﷺ) بەردەوام شیری پێدەدا، تا (أبو هريرة) تێر بوو و وتی: ئەی پێغەمبەری وخوا(ﷺ) ئیتر ناتوانم، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) خۆیشی لە شیرەکەی خواردەوە.

## پەند و ئامۆژگاری

١- لەپێناو وەرگرتنی زانست و ڕەزامەندی خوادا، دەبێت هەموو سەختیەک قبووڵ بکەین وەک چۆن (أبو هريرة) بەرگەی هەژاری و برسێتی دەگرت لە پێناو وەرگرتنی فەرموودەی زیاتردا.

٢-، دەبێت بەردەوام لە خزمەت فەرموودەکانی

پێغەمبەردا (ﷺ) بین و لێیان تێبگەین و لەبەریان بکەین.

٣-، دەبێت لەگەڵ دەوروبەرمان چاک بین و خاکی بین و هەژار و برسی تێر بکەین وەک چۆن پێغەمبەر(ﷺ) وایکرد.

جارێکیان (أبو هريرة) لەگەڵ پێشەوا (عمر)دا بوو، زۆر برسی بوو، فەرموودەی دەگێڕایەوە بۆ پێشەوا (عمر) و لەگەڵیدا ڕێی دەبڕی، تا گەیشتەوەماڵەوە، بەڵام کە گەیشتنەوە ماڵەوە پێشەوا (عمر) سەیری کرد هیچیان نەبوو، تا پێکەوە بیخۆین.

(أبو هريرة) هەمیشە پرسیاری دەکرد لە پێغەمبەر(ﷺ)، ڕۆژێکیان پرسیاری لێکرد ئەی پێغەمبەری خوا چ خەڵکێک لە ڕۆژی دواییدا باشترین شەفاعەتی تۆیان بەردەکەوێت؟

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی (أبو هريرة) دڵنیابووم پێش تۆ هیچ کەس ئەو پرسیارەم لێناکات، چونکە دەبینم زۆر سووریت لەسەر وەرگرتنی فەرموودە، ئەوەی لە ڕۆژی دواییدا زیاتر شەفاعەتی منی بەردەکەوێت کەسێکە بە پاک و پوختی لە دڵیەوە، یان لە دەروونییەوە بڵێ، (لا اله الا الله).

## پەند و ئامۆژگاری

پرسیارکردن لە شتە چاکەکان بە تایبەت سەبارەت بە هۆکارەکانی ڕزگاربوونمان لە ڕۆژی دواییدا کارێکی زۆر چاکە و هیچ عەیب نییە لەو بارەوە هەرچەند پرسیار بکەین لە کەسی زانا و شارەزا.

(أبو هريرة) حەزی دەکرد دایکی موسڵمان بێت، بۆیە زۆرجار داوای لە دایکی دەکرد موسڵمان بێت.

ڕۆژێکیان داوای کرد موسڵمان بێ کەچی دایکی تووڕە بوو و قسەی ناشیرینی بەرانبەر بە پێغەمبەر(ﷺ)کرد. (أبو هريرة)ش بەگریانەوە هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) من دایکم بانگ دەکەم، تا موسڵمان بێ کەچی ڕازی نابێ، ئەمڕۆش کە پێموت قسەی ناشیرینی بەرانبەر بە تۆ کرد.

ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نزا بکە بۆ دایکم ، بەڵکو خوا ڕێنمونی بکات، پێغەمبەریش(ﷺ) نزای بۆ کرد و فەرمووی: (خوایە، دایکی (أبو هريرة) ڕێنموونی بکە). (أبو هريرة)ش بە خۆشیەوە چوویەوە بۆ ماڵەوە، تا بە دایکی بڵێ کەچوویەوە تەقەی دا لە دەرگا، بەڵام دایکی دەرگای بۆ نەکردەوە.

پرسیار: بۆچی دایکی دەرگای بۆ نەکردەوە؟

وەڵام: چونکە دایکی موسڵمان بوو بوو و خۆی دەشۆرد، تا لە تاوانەکانی پاک ببێتەوە و بە پاکی بچێتە ناو ئایینی خواوە.

دایکی لە خۆشۆردن بوویەوە و هات و دەرگاکەی،کردەوە و شایەتومانی هێنا، (أبو هریرة)ش لەتاو خۆشیدا بە گریانەوە چوویەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و هەواڵی موسڵمانبوونی دایکی دا بە پێغەمبەر(ﷺ).

پێغەمبەریش(ﷺ) سوپاس و ستایشی خوای کرد، ئینجا (أبو هریرة) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا نزا بکە بۆ خۆم و دایکم، تا لە بەندە باوەڕدارەکانی خوا بین و باوەڕدارانمان لا خۆشەویست بکات. پێغەمبەریش(ﷺ) نزای بۆ کردن و فەرمووی: (خوایە، ئەم بەندەی خۆت ـ واتە: (أبو هریرة) ـ و دایکی ئەو لای بەندەکانت خۆشەویست و ئەو باوەڕدارانەش لای ئەوان خۆشەویست بکە).

ئیتر هەر باوەڕدارێک باس و ناوی (أبو هریرة)ی ببیستایە خۆشی دەویست.

**پەند و ئامۆژگاری:**

١-داوای نزای خێر بکەین لە کەسانی خواناس و چاکەکاری زیندوو نەک کەسانی مردوو.

٢-، دەبێت(أبو هريرة)مان خۆش بوێت، ئەوانەش ئەویان خۆش نەوێت ئەوە ڕێگەی هەڵەیان گرتۆتەبەر.

بەوجۆرە (أبو هريرة) لەسەر خواپەرستی و هاودەمی پێغەمبەر(ﷺ) بەردەوام بوو، تا کاتی کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ)، ئیتر (أبو هريرة) تەواو دڵگران و خەمبار بوو و دوای ئەوە هەرکات فەرموودەی دەگێڕایەوە ناوی پێغەمبەر(ﷺ) دەبرا لەتاو خۆشەویستی بۆ پێغەمبەر دەستی دەکرد بە گریان.

(أبو هريرة) کەسێکی نەرم و نیان و لەسەرخۆ و خاکی و دنیانەویست بوو، حەزی بە دەسەڵات نەدەکرد، هەمیشە سەرقاڵی گەیاندنی فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، تا ئەوەی لە تەمەنی پەنجاو نۆساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

لە نزای سەرەمەرگیدا دەیوت خوایە، من حەزم بە دیداری تۆیە دەی تۆش دیداری منت پێ خۆش بێ.

**پرسیارەکان**

١-ژیانی منداڵی (أبو هريرة) چۆن بوو؟

٢-بۆچی پێی دەوترا (أبو هريرة)؟

٣-هاوەڵانی صوففە کێ بوون؟

٤-دایکی (أبو هريرة) چۆن موسڵمان بوو؟

٥-(أبو هريرة) زیاتر خۆی سەرقاڵی چی دەکرد؟

٦-بەسەرهاتەکەی،(أبو هريرة) و پێشەوا (عمر) چۆن بوو؟

٧-ئایا (أبو هريرة)ت چەندە خۆش دەوێ؟

## ٢٥- (معاذ بن جبل)

یەکێک لە هاوەڵانی ئازیز و خۆشەویستی تری پێغەمبەر(ﷺ) (معاذ بن جبل) بوو. (معاذ) ئەو هاوەڵە گەورەیە بوو کە زۆر زوو موسڵمان بوو. پێغەمبەریش(ﷺ) سوێندی خوارد ئەی (معاذ) سوێند بە خوا من تۆم خۆشدەوێت، (معاذ)یش تەواو پێغەمبەری خوای لا خۆشەویست بوو، هەردەم لە خزمەتیدا بوو.

(معاذ بن جبل) لە (مدینة) دەژیا دوور لە شاری لە دایکبوونی پێغەمبەر(ﷺ).

(معاذ) بالآبەرز و هەڵکەوتە و جوان و بۆن خۆش بوو، ڕەنگی سپی و چاوەکانی گەورە بوون، کوڕێکی زۆر نەرم و نیان بوو.

لە (مدینة)دا سەرقاڵی ئیش و کار بوو، تا ئەوەی جارێکیان هەواڵی پێغەمبەری(ﷺ) بیست، بۆیە کاتێک لەگەڵ خەڵکدا چوون بۆ (مکة) بۆ حەج، لەوێ لە (مکة) لە شاخی عەقەبەدا

پێغەمبەری خوای (ﷺ) بینی و لەگەڵ هاوڕێکانیدا موسڵمان بوون و بەیعەتیان دا بە پێغەمبەر (ﷺ).

دواتر گەڕانەوە بۆ (مدینة)، ئیتر لەوێ (معاذ) بەردەوام بانگەوازی دەکرد بۆ ئیسلام و هەوڵی دەدا خەڵکی لە بێباوەڕیەوە بەرەو لای خوا ڕاکێشێت.

پیاوێک هەبوو کە گەورەی هۆزەکەی (معاذ) بوو ناوی (عمرو) بوو، کوڕی ئەم پیاوەش ناوی (معاذ) بوو، ئەویش لەگەڵ (معاذ)دا موسڵمان بوو بوو.

(عمرو) لەماڵەکەی خۆیدا بتێکی دانا بوو و دەیپەرست و زۆر خزمەتی ئەو بتەی دەکرد و ڕۆژانە دەیشۆرد و بۆنی خۆشی لێدەدا و دەیپەرست، ناوی ئەو بتەی نابوو (مەنات).

(معاذ بن جبل) لەگەڵ (معاذ)ی هاوڕێی و چەند گەنجێکی تری موسڵماندا شەو چوون و بتەکەیان برد و فڕێیاندایە ناو شەخەڵەوە، تا (عمرو) بزانێ ئەو بتە هیچی بەدەست نییە و ئیتر ئەو بتە نەپەرستێت.

بەیانی کە ڕۆژ بوویەوە (عمر) هات سەیری کرد بتەکەی دیار نەماوە، بۆیە خێرا چوو، تا بگەڕێ بەدوای بتەکەدا.

سەیری کرد لەناو شەخەڵدا فڕێ دراوە، خێرا هەڵیگرت و شۆردی و بۆنی خۆشی بەسەردا کرد و چوو لەناو خەڵکەکەدا تووڕە بوو، ووتی: کێ هێرشی بردۆتە سەر خواکەمان.

بۆ سبەی شەو هەمان شت ڕوویدایەوە و بەیانی سەیری کرد لەناو پیسایيدایە و هەمتر شۆردی و بۆنی خۆشی پیاداکرد و پێی وت: من نازانم کێ وات لێدەکات دەی، ئەگەر ڕاستە تۆ خوایت و سوودت هەیە خۆت بپارێزە.

شەو (معاذ) و هاوڕێکانی چوون بتەکەیان برد و بەستیانەوە بە سەگێکی تۆپیوەوە و فڕێیان دایە ناو شەخەڵ.

پرسیار: ئەی، ئەمجارەیان (عمرو) چی کرد؟

وەڵام: بەیانی (عمرو) سەیری کرد بتەکە نەماوە، بۆیە خێرا چوو بەدوایدا گەڕا، تا دۆزییەوە کە سەیری کرد وا پیس کراوە و نەیتوانیوە خۆی بپارێزێ وازی لە بتەکە هێناو زانی ئەو بتە خوا نییە و ئایینی ئیسلام ڕاستە، بۆیە چوو مسوڵمان بوو.

ئینجا کەوتە قسە کردن بۆ هۆزەکەی و پێی وتن ئەو مسوڵمان بووە و داوای کرد ئەوانیش موسڵمان بن، هۆزەکەشی هەموویان موسڵمان بوون.

**پەند و ئامۆژگاری:**

١-ژیری و زانایی بە گەورەیی و بچووکی نییە، ئەوەتا ئەو گەنجانە بە ژیری و لێزانی توانییان ببنە هۆی بەهۆش هاتنەوە و موسڵمان بوونی (عمرو) کە لە وان زۆر بەتەمەنتر بوو.

٢-پێویستە بەردەوام بانگەواز بکەین بۆ ڕێی خوا و بۆ ئەوەش بەڵگەی جوان و ژیرانە بەکار بهێنین، هەروەها هەوڵ بدەین لە بانگەواز و هەر کارێکی چاکدا سوود وەربگرین لە هاوڕێ چاکەکانمان وەک (معاذ) و هاوڕێکانی.

(معاذ) بەردەوام بەوجۆرە بانگەوازی دەکرد بۆ ئایینی خواو چاوەڕێ بوو پێغەمبەر(ﷺ) بێت بۆ (مدینة)، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ (مدینة) (معاذ) زۆر دڵخۆش بوو، بەردەوام لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بوو و زانستی لێ وەردەگرت، تا ئەوەی بوو بە زانایەکی ناوداری ناو هاوەڵان.

تەنانەت هێندە جوان فێری قورئانی پیرۆز بوو بوو پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: (قورئان لە چوار کەسەوە وەربگرن، (إبن مسعود) و (معاذ بن جبل) و (أبي) و (سالم)ی مەولای (أبو حذیفة)) هەروەها هێندە شارەزای شەریعەتی ئیسلام بوو بوو پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: (لە ناو ئومەتەکەمدا شارەزاترین کەس بە حەڵاڵ و حەرام (معاذ)ە).

پێغەمبەر(ﷺ) زۆر ڕێزی (معاذ)ی دەگرت و هەمیشە لە خۆی نزیک دەکردەوە، تەنانەت جاری وا هەبوو پێغەمبەر(ﷺ) کە سواری گوێدرێژ دەبوو لە دوای خۆیەوە (معاذ)ی سوار دەکرد و قسەی بۆ دەکرد.

جارێکیان پێغەمبەر(ﷺ) لە ناو هاوەڵانیدا بوو وەسفی

(معاذ)ی دەکرد و فەرمووی (بە ڕاستی (معاذ) پیاوێکی زۆر چاکە).

ئیتر خۆشەویستی نێوان (معاذ) و پێغەمبەر(ﷺ) ناسراو و بەرچاو بوو.

(معاذ) کەسێکی زۆر خواناس و لەخواترس بوو، زۆر بە چاکی ئەمانەت و سپاردەی دەپاراست.

هەروەها زۆر شەرمی دەکرد لە پەروەردگاری، تەنانەت لە کاتی موسڵمان بوونییەوە، تا مردنی بۆ یەکجاریش لەلای ڕاستیدا تفی نەدەکرد، هەمیشە زیکری خوای دەکرد و دەم بە زیکر بوو.

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاری دا کەسێک بنێرێت بۆ (یمن)، تا فێری ئیسلامیان بکات (معاذ بن جبل)ی هەڵبژارد، چونکە زۆر زانا و شارەزا بوو، پێغەمبەر(ﷺ) (معاذ)ی ڕاسپارد، تا بچێ و سواری وڵاخێکی کرد و خۆیشی بە پێ لەگەڵیدا چوو تا دەرەوەی (مدینة)، تاماڵئاوایی لێ بکات.

(معاذ) دەیزانی، تا ئەو بێتەوە پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی دەکات، بۆیە زۆر دڵگران بوو، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: (ئەی (معاذ) لەوانەیە ساڵێکی تر دوای ئەمە بە من نەگەیتەوە و لەوانەیە بدەیت بە پاڵ ئەم مزگەوتەم و گۆڕەکەمدا)، ئیتر (معاذ) تەواو دڵگران و خەفەتبار بوو.

لەسەردەمی پێشەوا (عمر)دا کاتێک (معاذ) لە (مدینة) دەژیا پێشەوا (عمر) چوار سەد دیناری نارد بۆ (معاذ بن جبل). (معاذ)یش هەمووی دابەشکرد بەسەر خەڵکی هەژاردا و تەنها دوو دیناری بۆ خۆی هێشتەوە.

دوای ئەوە (معاذ) لە هەموو جەنگ و غەزاکاندا بەشداری دەکرد و بەرانبەر بە بێباوەڕان دەجەنگا بەتایبەت دژ بە ڕۆمەکان، لە ڕۆژی جەنگی یەرمووکدا (معاذ) سەرکردەی لای ڕاستی سوپای ئیسلام بوو، بە سەختی دژ بە ڕۆمەکان جەنگا و خۆڕاگرانە بەرانبەریان وەستا.

دواتر (معاذ) کۆچی کرد بۆ (شام) و کەوتە بڵاوکردنەوەی زانست و گەیاندنی ئیسلام بە خەڵک، خەلیفە (عمر) بڕیاریدا (معاذ) بکات بە ئەمیری (شام)، تا کاروباری ئەوێ بەڕێوە ببات، بەڵام هێندەی نەبرد تووشی نەخۆشی تاعوون بوو و خۆڕاگر و سوپاسگوزار بوو لەسەری، تا ئەوەی شەوێکیان تەواو ناڕەحەت بوو و کۆچی دوایی کرد و بۆ بەیانییەکەی تەرمەکەی ئەسپەردە کرا.

**پەند و ئامۆژگاری:**

١- سامان تەنها بەشی خۆمان نییە، دەبێت بەشی پێویست هەڵگرین و بەوی تریشی یارمەتی خوشک و براکانمان بدەین.

٢-هەر نەخۆشی و ناڕەحەتیەک دێت، دەبێت سوپاسی خوای لەسەر بکەین.

**پرسیارەکان:**

١-(معاذ) کەی موسڵمان بوو؟

٢-(معاذ) چی کرد، تا (عمرو) موسڵمان بێت؟

٣-پێغەمبەر(ﷺ) بەرانبەر بە (معاذ) چی دەفەرموو؟

٤-تا ئێستا پێشتر ژیانی (معاذ)ت خوێندوەتەوە؟

٥-بۆچی (معاذ) کۆچی کرد بۆ (شام)؟

٦-چۆن (معاذ) دەیزانی کە ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) نابینێتەوە، کە چوو بۆ (یمن)؟

٧-دەتوانیت چیرۆکی (معاذ) بگێڕیتەوە بۆ کەسێکی خۆشەویستی خۆت؟

## ٢٦- (صهيب الرومي)

یەکێکی تر لە هاوەڵانی خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) ناوی (صهیب) بوو کە پێی دەوترا (صهیب)ی ڕۆمی. ئەمە ئەو هاوەڵە بوو لە پێناو خوادا وازی هێنا لە هەموو سامانی خۆی، تا خۆی بگەیەنێت بە پێغەمبەری خوا. پێغەمبەریش(ﷺ)پێی دەفەرموو: (صهیب) براوە بوو، (صهیب) براوە بوو.

(صهیب) کوڕی یەکێک لەو دەسەڵاتدارانە بوو کە لە عێرقدا دەژیا و دەسەڵاتێکی زۆری هەبوو، کاربەدەستی کیسرای فارس بوو، باوکی (صهیب) لە ناوچەی ئوبللە دەسەڵاتدار بوو، ئیتر بەو هۆیەوە (صهیب) بەردەوام لە خۆشیدا دەژیا و سەختی و ناڕەحەتی نەهاتە ڕێی.

پرسیار: ئەگەر (صهیب) لە عێراقدا ژیاوە ئەی بۆچی پێی دەڵێن: ڕۆمی؟

وەڵام: چونکە هەرچەندە (صهیب) لە عێراقدا لە دایک بوو، بەڵام دواتر ماوەیەکی زۆر لە ناو ڕۆمیەکاندا ژیانی بردەسەر.

ڕۆژێکیان (صهیب) لەگەڵ دایکیدا هاودەم بە چەند پاسەوان

و چەند خزمەتگوزارێک لە ناوچەی خۆیان چوونە دەرەوەو چوون بۆ ناوچەیەکی تر، کەچی لەو کاتەدا ڕۆمەکان هێرشیان بردە سەر ئەو ناوچە و هەرچی پاسەوان و پیاوەکان هەبوون کوژران و ژن و منداڵەکانیش بە کۆیلە گیران.

(صهیب)یش یەکێک بوو لەو منداڵانەی کە ڕۆمەکان گرتیان و بردیان بۆ بازاڕو وەک کۆیلە فرۆشتیان، ئیتر هەرجارە و (صهیب) لای کەسێک کۆیلە بوو و خزمەتی دەکرد و دواتر دەفرۆشرا بە کەسێکی تر، بەوجۆرە ژیانێکی ناخۆشی کۆیلایەتی بەشی ئەو منداڵە هەژارە بوو.

جارێکیان (صهیب) تەواو لە دەست ستەمی یەکێک لە گەورەکانی بێزار بوو، بۆیە بڕیاری دا خۆی ڕزگار بکات، بۆیە ڕای کرد و چوو بۆ شاری (مکة)و لەوێ لەگەڵ کەسێکدا ڕێک کەوت و کەوتە ئیشکردن و دابینکردنی بژێوی ژیانی خۆی و لە (مکة)دا بەرەبەرە گەورە دەبوو.

جارێکیان (صهیب) لەدەمی یەکێک لە زانا مەسیحیەکانەوە بیستبووی کاتی ئەوەیە لەناو عەرەبدا لە (مکة) پێغەمبەری کۆتا زەمان دەربکەوێت، بۆیە (صهیب) بە تامەزرۆییەوە چاوەڕێ بوو ئەو پێغەمبەرە دەربکەوێت، تا خێرا باوەڕی پێ بهێنێت.

هێندەی نەبرد هەواڵی هاتنی پێغەمبەری خوای بیست.

بیستی دەیانوت: (محمد بن عبدالله) بانگەواز دەکات بۆ ئاینێکی نوێ و بڕوای نییە بە بتەکان و دەڵێت: دەبێت تەنها یەک خوا بپەرستیت، بۆیە بەیانی زوو پێش ئەوەی خەڵکی لە ماڵەکانیان بێنەدەر (صهیب) کەوتە ڕێ بەرەو ماڵی (أرقم).

پرسیار: ماڵی (أرقم) چی بوو؟

وەڵام: ئەو ماڵە بوو کە لە (مکة)دا تیایدا هاوەڵان بە نهێنی کۆدەبوونەوە و پێغەمبەری خوایان دەبینی و لەوێ پێغەمبەر(ﷺ) باسی ئایینی خوای بۆ دەکردن.

(صهیب) بە نهێنی چوو بۆ ماڵی (أرقم) و سەیری کرد (عمار بن یاسر) لە بەردەرگایە، کەمێک وەستاو دواتر لێی نزیک بوویەوە و وتی:

ئەی (عمار) لێرە چی دەکەیت؟

ئەویش وتی: ئەی تۆ چی دەکەیت؟

(صهیب) وتی: دەمەوێ بچم بۆ لای (محمد) و وتەکانی ببیستم بزانم چی دەڵێت.

(عمار)یش وتی: منیش بۆ هەمان شت هاتووم.

بۆیە پێکەوە چوونە ژوورەوە، لەوێ گوێیان گرت لە پێغەمبەر(ﷺ) و تامەزرۆی ئیسلام بوون و خێرا لەوێ موسڵمان بوون و وازیانهێنا لەو بتپەرستیەی لە (مکة)دا باو بوو، هەموو ڕۆژەکە لای پێغەمبەر(ﷺ) مانەوە، تا شەو داهات، ئەو کات بە نهێنی چوونەوە بۆ ماڵی خۆیان.

**پەند و ئامۆژگاری:**

دەبێت بە چاکی بچین بە دوای ڕاستی و وەرگرتنی زانستدا، وەک چۆن (صهیب) چوو بۆ ماڵی (أرقم).

دوای ئەوە (صهیب) زۆر بەخۆشی و بەختەوەریەوە ژیانی دەبردە سەرو وا هەستی دەکرد بەو موسڵمان بوونەی تازە لەدایک بووە.

هێندەی نەبرد بێباوەڕەکان زانییان (صهیب) موسڵمان بووە، ئیتر کەوتنە گاڵتە پێکردن و قسە پێوتن و سزادانی، ئیتر لە گەرمای ناو (مكة)دا بەسەر بەرد و خاکدا ڕایاندەکێشا و بە قامچی لێیان دەدا و بەردی گەورەیان لە سەر سکی دادەنا و هەر سزایەکی سەختیان بۆ بەکار دەهێنا، بەڵام (صهیب) ئامادە نەبوو بە هیچ جۆرێک دەستبەرداری ئایینەکەی ببێت.

پاش ماوەیەک پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاریدا موسڵمانان کۆچ بکەن بۆ (مدينة)، بەڵام (صهیب) ڕێی لێگیرا کۆچ بکات، بێباوەڕەکان پێیان وت: دەبێت هەموو پارە و سامانەکەت دابنێیت، ئینجا بچیت بۆ (مدينة).

پرسیار: ئایا ئەو کات پێغەمبەر(ﷺ) لەکوێ بوو؟

وەڵام: ئەو کات پیغەمبەریش(ﷺ) کۆچی کردبوو بۆ (مدينة).

(صهیب)یش بڕیاریدا چی سامان و پارەی هەیە بیدات بەوان، تا ڕێی پێ بدەن خۆی بگەیەنێتە پێغەمبەر(ﷺ)، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) ئەمەی بیست فەرمووی (أبو یحیی)(صوهیەب) بردیەوە، (أبویحیی) بردیەوە.

بێباوەڕەکان بەوەشەوە وازیان نەهێنا لە (صهیب) و کەوتنە شوێنی، (صهیب)یش تیر و کەوانەکەی دەرکرد و پێی وتن: بەخوا ناهێڵم بگەنە لام، تا بەم چل تیرەی پێمە چل کەستان نەکوژم، دوای ئەوەش بە شمشێر لێتان ئەدەم.

ناچار ئەوانیش ترسان و گەڕانەوە و وازیان لێ هێنا، ئیتر (صهیب) کەوتە ڕێ، تا گەیشتە (مدینة) و بە دیداری پێغەمبەری خوا(ﷺ) شادبوویەوە.

(صهیب) کەسێکی زۆر بەخشندە و دەست کراوە بوو، هەروەها کەسێکی زۆر خاکی و نەرم و نیان و ڕووخۆش و قسە خۆش بوو، بە قسە خۆشەکانی دڵی هاوەڵانی خۆش دەکرد، هەرگیز کەسی تووڕە نەدەکرد.

(صهیب) بەردەوام لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) بوو، بەشداری غەزاکانی دەکرد و لە جەنگی بەدردا بەشداری کرد، ئیتر، تا کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) هەمیشە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بوو، هەروەها لەیەک جەنگ دوا نەدەکەوت.

پێغەمبەر(ﷺ) کە کۆچی دوایی کرد زۆر لە (صهیب)

ڕازی بوو و هاوەڵانیش (صهیب)یان زۆر خۆش دەویست.

پێشەوا (أبوبکر) و پێشەوا (عمر)یش لە کاتی دەسەڵاتیاندا ڕاوێژیان پێ دەکرد، تەنانەت کاتێک پێشەوا (عمر) لەلایەن دوژمنێکی ئیسلامەوە بریندار کرا فەرمانی کرد (صهیب) بەرنوێژی بکات بۆ خەڵک، لە کاتی ئەسپەردەکردنی تەرمی پێشەوا (عمر)یشدا (صهیب) لەگەڵ پێشەوا (عثمان)دا چوونە ناو گۆڕەکە و تەرمی پێشەوا (عمر)یان داگرت و دانا.

پێشەوا (عثمان)یش بە هەمان شێوە لە سەردەمی دەسەڵاتی خۆیدا زۆر ڕێزی (صهیب)ی دەگرت، بەڵام هێندەی نەبرد پێشەوا (عثمان)یش کۆچی دوایی کرد.

(صهیب) لە سەردەمی پێشەوا (علي)شدا بە هەمان شێوە ژیا، تا ئەوەی دوای تەمەنێکی زۆری هەوڵ و خزمەت کردن بە ئیسلام لە ساڵی سی و هەشتی کۆچیدا لە شاری (مدینة)دا کۆچی دوایی کرد و لەوێش تەرمەکەی ئەسپەردە کرا.

**پەند و ئامۆژگاری:**

باوەڕ و ئیمان لە هەموو شتێک بە بایەخ و گرانبەهاترە وەک چۆن بینیمان (صهیب) لە پێناو پاراستنی ئیمانەکەیدا ئامادەبوو دەستبەرداری هەموو سامانی خۆی ببێت.

**پرسیارەکان:**

١-بۆچی به (صهیب) دەوترا ڕۆمی؟

٢-(صهیب) چۆن کرا به کۆیله و چۆن خۆی له کۆیلایەتی ڕزگار کرد؟

٣-باسی موسڵمان بوونی (صهیب) بکه؟

٤-پێغەمبەر(ﷺ) چی فەرموو به (صهیب)؟

٥-ژیانی (صهیب) دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) چۆن بوو؟

٦-کاتێک بێباوەڕان ڕێیان گرت به (صهیب) بۆ کۆچکردن (صهیب) چی کرد؟

٧-بزانه دایک و باوکت، یان برا و خوشکەکانت وەک تۆ چیرۆکی (صهیب) دەزانن؟

## ٢٧- (عبدالله بن عباس)

(عبداللـه بـن عبـاس) هـاوەڵێکی ئـازیز و خۆشەویستی پێغەمبەری خوا و ئامۆزای پێغەمبەری خوا بوو، لەگەڵ ئەوەی تەمەنی کەم بوو، بەڵام هێندەی زانایان زیاتر زانستی پێ بوو. پێغەمبەر(ﷺ) نزای زانستی بۆ دەکرد و هەمیشە ئامۆژگاری دەکرد، ئەویش زۆر پێغەمبەری خوای خۆشدەویست.

(عبدالله بن عباس) بوو، (عباس)یش مامی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو، ئەوان لە (مکـة) دەژیـان و لای خەڵکی بەرێزبوون.

پێغەمبەر(ﷺ) (عباس)ی مامی خۆی زۆر خۆشدەویست، (عباس)یش بەهەمان شێوە، هەروەها (عباس) پێش فەتحی (مکة) موسڵمان بوو بوو، بەڵام کۆچی نەکرد بۆ (مدینة) و لە (مکة) مایەوە و نەیهێشت کەس بە موسڵمان بوونی بزانێت.

پرسیار: بۆچی (عباس) کۆچی نەکرد بۆ (مدینة)؟

وەڵام: تـا هەواڵـی بێباوەڕەکـان بزانێـت و بیگەیەنێـت بە پێغەمبەر(ﷺ).

ڕۆژێکیان پێغەمبەر(ﷺ) ژنەکەی (عباس)ی بینی و پێی وت تۆ سکت دەبێت و لەو سکەش منداڵێکی زیرەک و ژیرت دەبێت، هەرکات ئەو منداڵەت بوو خێرا بیهێنن بۆ لام، ئەوە بوو پاش ماوەیەک ئەو ئافرەتە منداڵێکی بوو و منداڵەکەیان برد بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ). پێغەمبەریش(ﷺ) ناوی نا (عبدالله) و شیرینی دا لە لێوی و بە دایکی (عبدالله)ی فەرموو: بیبە دەیبینیت ئەم منداڵەت ژیر و زیرەک دەردەچێت.

ئافرەتەکەش خێرا چوویەوە بۆ لای (عباس)ی مێردی و بەسەرهاتەکەی بۆ باسکرد.

(إبن عباس) لەگەڵ دایکیدا دەژیا و بەرە بەرە گەورە دەبوو و ئەویش لەگەڵ دایک و باوکیدا موسڵمان بوو بوو، بەڵام هەموویان موسڵمان بوونەکەی خۆیان شاردبوویەوە، تا بێباوەڕەکان پێیان نەزانن.

دواتر کاتێک سەردەمی فەتحی (مکة) هات و پێغەمبەر(ﷺ) (مکة)ی ئازاد کرد (إبن عباس) بەردەوام لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بوو و زانستی لێوەردەگرت، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) زۆر (عبدالله)ی خۆش دەویست و نزای خێر و دانایی و زیرەکی و زانستی بۆ دەکرد.

شەوێکیان پێغەمبەر(ﷺ) لە ماڵی یەکێک لە خێزانەکانی خۆی بوو، (عبدالله) لەوێ لەلای پێغەمبەر(ﷺ) بوو.

(عبداللـه) تەشـتێک ئـاوی بـۆ دەسـتنوێژی پێغەمـبەر(ﷺ) دانابوو، چونکە دەیزانی پێغەمبەر(ﷺ) شەو هەڵدەستێت بۆ شـەو نوێژ کردن.

کاتێـک پێغەمـبەر(ﷺ) هەسـتا سـەیری کـرد، ئـاوی دەستنوێژی بۆ دانراوە، خێزانەکەی پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو ئاوە (عبدالله) بۆی داناویت پێغەمبەریش(ﷺ) نزای کرد بۆ (عبدالله) و فەرمووی: (خوایە، شارەزای ئایینی بکە و فێری لێکدانەوەشی بکە).

شـەوێکیان (عبداللـە) لە مـاڵی پێغەمـبەر(ﷺ) بـوو، شـەو پێغەمـبەر(ﷺ) هەستا بـۆ شـەو نـوێژ، (عبداللـە)یش هەستا و لەگەڵیدا بوو، پێغەمبەر(ﷺ) ویستی نوێژ بکات و (عبدالله)ی لە پاڵ خۆیەوە دانا تا لەگەڵیدا نوێژ بکات.

بەڵام کاتێـک پێغەمـبەر(ﷺ) دەسـتی کـرد بە نـوێژ (عبدالله) لەبەر زۆر شەرم کردنی لە پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە دواوە، کاتێـک پێغەمـبەر لە نـوێژەکەی بـوویەوە لێـی پرسـی بۆچی واتکرد؟

وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چۆن دەکرێت من لە پاڵ تۆوە نوێژ بکەم لە کاتێکدا تۆ پێغەمبەری خوایت؟

پێغەمبەر(ﷺ) بەو قسەی سەرسام بـوو و نزای خێر و زانستی بـۆ کـرد، ئینجـا پێغەمـبەر(ﷺ) ڕاکشـا و خەوت، بەڵام

(عبدالله) هەر سەیری پێغەمبەری خوای دەکرد و نەخەوت، تا بانگی بەیانی.

**پەند و ئامۆژگاری:**

١-دەبێت هەوڵ بدەین زۆر لە خزمەت زانایان و خواناساندا بین وەک چۆن دەبینین (إبن عباس) زۆرجار بەشەو دەچوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ).

٢-هەوڵ بدەین لەگەڵ دایک و باوکماندا هەستین بۆ شەونوێژ با تەنها دوو ڕکاتیش بێ ئەوە لای خوا زۆر گەورەیە.

٣-پێویستە زۆر ڕێزی زاناو کەسە خواناسەکان بگرین و بە ڕێزەوە سەیریان بکەین.

(عبدالله) زۆر گوێی دەگرت لە ئامۆژگاریەکانی پێغەمبەر(ﷺ) و لە بیری نەدەکردن، جارێکیان پێغەمبەر(ﷺ) ئامۆژگاری دەکرد پێی فەرموو:

(ئەی منداڵ من چەند وشەیەکت فێر دەکەم، سنوری خوا بپارێزە خواش تۆ دەپارێزێت، سنوری خوا بپارێزە دەبینیت خوات لەگەڵ دەبێت، ئەگەر داوای شتێکت کرد لە خوا داوا بکە، ئەگەر ویستت پشت و پەنا بگریت تەنها پشت بە خوا ببەستە. ئەوەش بزانە ئەگەر هەموو خەڵک کۆببنەوە و بیانەوێت سودێکت پێ بگەیەنن هەرگیز ناتوانن هیچ سودێکت پێ

بگەیەنن مەگەر خوا خۆی بۆی دابنابێت، ئەگەریش هەموو خەڵک کۆببنەوە، تا زیانت پێ بگەیەنن ناتوانن هیچ زیانت پێ بگەیەنن مەگەر خوا لە سەری نوسیبێت، بزانە، ئەگەر لەسەر شتە سەخت و ناخۆشەکان خۆڕاگربیت خێر و چاکەی زۆری تیایە بۆت، سەرکەوتن بە خۆڕاگریەوە دەبێت، لەگەڵ نارەحەتیدا دەروکردنەوە هەیە، لەگەڵ سەختیدا ئاسانی دێت).

**پەند و ئامۆژگاری:**

١-، دەبێت لەوە دڵنیابین هەموو شتێک بەدەست خوایە، بەندەکان بەبێ ویستی خوا هیچیان پێ ناکرێت.

٢-ئەگەر سەختی و ناخۆشیەکمان هاتەڕێ خۆڕاگر و سوپاسگوزار بین، چونکە بە دڵنیاییەوە بەدوایدا خۆشی دێت.

تەنانەت (إبن عباس) (جبرئیل)ی فریشتەی خوای بینی، جارێکیان لەگەڵ باوکیدا چوون بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) پشتی تێکردبوون و سەرقاڵ بوو.

(عباس) وتی: ئەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) وایکرد؟

(عبدالله) وتی: باوکە گیان دەی کەسێکی تری لەلا بوو سەرقاڵ بوو، (عباس) ووتی: کوڕم من کەسم نەدی لەلای بێ.

هەردووکیـــــان چـــــوونەوە بـــــۆلای پێغەمـــــبەر(ﷺ) و بەسـەرهاتەکەیان بـۆ گێـڕایەوە، پێغەمـبەر(ﷺ) بە (عـبداللـە)ی فەرموو :

ئەو کەسەت بینی؟

وتی:بەڵێ.

فەرمووی: دەی ئەوە (جبرئیـل) بـوو لەبەر ئەوە سـەرقاڵ بـووم و نەهاتم بۆ لای ئێوە.

بەوجۆرە (عـبدالله) هەمیشـە لەگەڵ پێغەمـبەردا(ﷺ) بـوو و زانسـتی لێـوەردەگرت، تـا ئەوەی کـاتی وەفـاتی پێغەمـبەر(ﷺ) هات و پێغەمبەری خوا دنیای بەجێهێشت.

(عبداللـە) تەواو دڵگـران و بێتـاقەت بـوو، ئەوکـات تەمەنـی سـیانزە سـاڵ بـوو، کەچـی هێنـدەی کەسـە بەتەمەنەکـان زیـاتر زانستی لە پێغەمبەر(ﷺ) وەرگرتبوو.

(إبـــن عبـــاس) دوای ئەوە بەردەوام لەگەڵ هـــاوەڵە گەورە و بەڕێزەکـــانی پێغەمـــبەردا(ﷺ) دەژیـــا، تـــا زانســـت لەوانـــیش وەربگرێـت، هەروەهـا زانسـتیشـی فێـری خەڵکـی دەکـرد. ئیتـر زیرەکی و زانایی (عبدالله) لەناو خەڵکدا دیار بوو.

لەسـەردەمی پێشـەوا (عمـر) و پێشـەوا (عثمـان)دا ئەو پێشـەوا گەورە و بەڕێـزانە هەمیشـە بـۆ مەسـەلەکان ڕاوێژیـان دەکـرد بە (عبدالله) و قسـەی ئەویـان لا گرنـگ بـوو، ئەویـش ڕاسـترینی

شتەکانی پێ دەوتن.

(عبدالله) زۆر لەخواترس و خواناس بوو، پەرستشی زۆری دەکرد، کەسێکی نەرم و نیان و ڕووخۆش و سادە بوو، لەگەڵ خەڵکی چواردەوریدا زۆر چاک بوو. تەنانەت جارێکیان کەسێک بە توندی قسەی ناشرینی وت بە (أبن عباس) کەچی ئەو زۆر بە نەرم و نیانی وەڵامێکی جوانی دایەوە و لەبری توڕەبوون لێی شتێک لە زانستی فێر کرد.

بەڵام لەو شتانەدا کە بەزاندنی سنوری خوا بوایە، زۆر توند بوو و بە سەختی ڕێی لێ دەگرتن.

ڕۆژانە خەڵکی دەهاتن بۆ لای و پرسیاریان لێدەکرد و ئەویش وەڵامی دەدانەوە، هاوەڵانیش ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر ئەویان خۆشدەویست.

بەو جۆرە ژیا، تا دواجار ئەویش ژیانی دنیای بەجێهێشت و گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاری خۆی.

**پەند و ئامۆژگاری:**

١-دەبێت لەسەرخۆ و نەرم ونیان بین، ئەگەر کەسێکیش خراپەی بەرانبەرمان هەبوو ئێمە لەگەڵیدا چاک بین.

٢-ڕاوێژکردن شتێکی زۆر پێویستە وەک چۆن هاوەڵان لەنێو خۆیاندا لەسەر مەسەلەکان ڕاوێژیان دەکرد.

**پرسیارەکان:**

١-(عبدالله) چ خزمایەتیەکی لەگەڵ پێغەمبەر هەبوو؟

٢-(عبدالله) کەی موسڵمان بوو؟

٣-دەتوانیت ئامۆژگاریەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ (عبدالله) باس بکەیت؟

٤-پێغەمبەر(ﷺ) زیاتر چ نزایەکی دەکرد بۆ (عبدالله)؟

٥-بۆچی (عباس) کۆچی نەکرد بۆ (مدينة)؟

٦-ئەم چیرۆکە باس بکە بۆ کەسێکی زۆر خۆشەویستی خۆت.

## ٢٨- (فاطمة بنت محمد)(ﷺ)

(فاطمة) کچی پێغەمبەری خوا و گەورەی ژنانی بەهەشت و خۆشەویستی خوا و پێغەمبەری خوا و موسڵمانانە. (فاطمة) ژنی (علي بن أبوطاليب)ی خەلیفەی چوارەمی موسڵمانان و ئامۆزای پێغەمبەری خوایە. (فاطمة) دایکی دوو خۆشەویستی پێغەمبەری خوا (حسن) و (حسین)ە، ئافرەتێک کە پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی پێدا یەکەم کەسیەتی دوای مردنی پێغەمبەر(ﷺ) بە دیداری پێغەمبەر(ﷺ) شاد دەبێتەوە.

(فاطمة بن محمد)ی پێغەمبەری خوا لە (مكة) لەدایک بوو، کچە بچکۆلەی پێغەمبەری خوا بوو، دایکی (فاطمة)ش (خديجة بنت خويلد) بوو، واتە دایکی باوەڕداران دایکی (فاطمة) بوو. ئیتر (فاطمة) لە کۆشی گەورەترین و چاکترین دایک و باوکدا پەروەردە بوو. باوکی پێغەمبەر و دایکیشی دایکی باوەڕداران و ئافرەتێک بوو کە مۆژدەی بەهەشتی پێدرا بوو، براکانیشی بە منداڵی کۆچی دواییان کرد بوو، خوشکەکانیشی بریتی بوون لە (زينب) و (رقية).

(فاطمة) کاتێک زانی (محمد)ی باوکی بووە بە پێغەمبەر خێرا موسڵمان بوو و ئیتر بەردەوام هەموو زانیاریەکی ئایینی ئیسلامی لە باوکی وەردەگرت و لەگەڵ باوکیدا نوێژی دەکرد و بەردەوام پەرستشی خوای دەکرد.

(فاطمة) هەمیشە هەستی دەکرد کە پێغەمبەری خوا لەپێناو گەیاندنی پەیامی خوادا زۆر ماندوو دەبێت، بۆیە هەمیشە هەوڵی دەدا یارمەتیدەری باوکی بێ و بە دەمیەوە بوو. دەیویست ئەگەر بە قسە، یان بە پێکەنین و بزەیەکیش بێت ئازاری سەرشانی پێغەمبەر(ﷺ) نەهێڵێت.

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) وەک یارمەتیدانی ( أبوطالیب)ی مامی کە پیر بوو بوو (علي) ئامۆزای خۆی هێنا بۆ ماڵی خۆیان و خۆی پەروەردەی دەکرد، ئیتر (علي)ش، تا تەواو گەورە بوو لەگەڵ (فاطمة)دا لە ماڵی پێغەمبەری خوا دا دەژیا بەبێ ئەوەی هیچ هەڵەیەکی بچووکیش ڕوویدات، بەڵکو ئەویش خێرا موسڵمان بوو و لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بوو.

ڕۆژێکیان (فاطمة) چوویە دەرەوە، باوکیشی لە مزگەوتی کەعبەدا نوێژی دەکرد، بێباوەڕانیش گاڵتەیان پێدەکرد و ئازاریان دەدا، ئەوە بوو پیسایی ناو سکی وشتریان هێناو کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) چوو بە سوجدەدا بێباوەڕەکان ئەو ناوسکەیان کرد بەسەر پێغەمبەری خوادا. (فاطمة) کە ئەوەی بینی تەواو

تـــووڕە بـــوو و خێـــرا پیســـیەکەی لەســـەر شـــان و ســـەری پێغەمبەر(ﷺ) لابرد و لەگەڵ باوکیدا بەرەوماڵەوە گەڕایەوە.

بەوجۆرە (فاطمة) زۆر بێتاقەت دەبوو کە دەیبینی بەو شێوەیە باوکی لەلایەن کەسە پیس و خراپە کارەکانەوە ئازار دەدرێت، بەڵام دەیزانی گەیاندنی پەیامی خوا بەبێ ئازار و ناڕەحەتی ناگاتە ئەنجام.

ئەوەبوو دواجار پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاریدا هەموو موسڵمانان کۆچ بکەن بۆ (مدينة)، تا لە دەست ئەو ستەمە زۆرە ڕزگاریان بێت و بتوانن خێراتر لە (مدينة)دا بانگەوازی خوا بگەیەنن و دەوڵەتی ئیسلام دابمەزرێنن.

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانان چوون بۆ (مدينة) و بەهێزبوون لەگەڵ بێباوەڕاندا جەنگان و هەردوو جەنگی بەدر و ئوحودیش ڕوویاندا، هەروەها لە (مدينة)دا (فاطمة)ی کچی پێغەمبەر(ﷺ) شووی کرد.

پرسیار: (فاطمة) شووی بە کێ کرد؟

وەڵام: (فاطمة) شووی کرد بە (علي بن أبوطاليب) کە ئامۆزای پێغەمبەر(ﷺ) بوو.

پێشەوا (علي) خۆی ڕووی نەبوو بچێتە داوای (فاطمة)، بۆیە کەسێکی تری نارد بۆ داوای (فاطمة) و پێغەمبەریش(ﷺ) ڕازی بوو و پێشەوا (علي) بانگ کرد و (فاطمة)ی لێ

مارەکرد، بەوەش خێزانێکی نوێی باوەڕداریان پێکهێنا.

بەڵام لەڕووی ئابووریەوە زۆر هەژاربوون و زۆرجار نان و خواردنیان نەبوو، تا نان بخۆن و بە برسێتی دەخەوتن. جارێکیان چەند ڕۆژێک نانی وایان نەخواردبوو، ئەوە بوو بڕێ گۆشت هات بۆ (فاطمة)، ئەویش ئامادەی کرد و هەڵیگرت، تا پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆماڵیان تاوەکو لەگەڵ باوکیشیدا پێکەوە بیخۆن، چونکە دەیزانی باوکیشی وەک ئەوان زۆربەی جارەکان برسییە و نانێکی وا نییە بیخوات، چونکە لەو ماوەدا موسڵمانان هەژار و کەمدەست بوون.

لەو ماوەشدا خوای گەورە منداڵێکی جوان و نازداری پێ بەخشین کە ئەویش (حسن) بوو. پێغەمبەر(ﷺ) خۆی ناوی ئەو منداڵەی نا (حسن) و بانگی فەرموو بە گوێیدا و خورمای دا لە لێوی و نزای بۆ کرد، هەروەها مەڕێکی بۆ کرد بە خێر.

پاش (حسن)یش خوای گەورە منداڵێکی تری پێبەخشین کە ئەویش (حسین)بوو. ئەم دوانە دوو ڕەیحانەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بوون. پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: (حسن) و (حسین)گەورەی گەنجانی بەهەشتن. پێغەمبەر(ﷺ) زۆر خۆشی دەویستن و زۆرجار دەیگرتنە باوەش و دەیبردنەوە بۆ ماڵەوە و دواتریش دەیبردنەوە بۆ لای دایکیان.

ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژانە سەردانی ماڵی (فاطمة)ی دەکرد

و سەردانی (علي) و (فاطمة) و (حسن) و (حسین)ی دەکرد و هەندێ جاریش بەیەکەوە نانیان دەخوارد، لەو ماوەدا یەکێک لە خوشکە ئازیزەکانی (فاطمة) کە ژنی پێشەوا (عثمان) بوو بە نەخۆشی کۆچی دوایی کرد.

**پەند و ئامۆژگاری:**

١-هەوڵ بدەین ئازار و ناڕەحەتی سەرشانی کەسانی چواردەورمان نەهێڵین بەتایبەت ئازار و ناڕەحەتی دایک و باوکمان، چونکە زۆر ماندوو بوون بۆ ئێمە و هەر چاکەیەکیان لەگەڵ بکەین هێشتا کەمە.

٢-دەبێت لەپێناو ئیسلامدا بەرگەی هەر سەختیەک بگرین، وەک چۆن پێغەمبەر(ﷺ) بەرگەی سەختیەکانی دەگرت.

٣-پێویستە (فاطمة) و (علي) و (حسن) و (حسین)مان خۆش بوێن، چونکە پێغەمبەری خوا خۆشی ویستون و نزای بۆ کردون.

جارێکیان هەریەک لە (فاطمة) و (علي) لەتاو زۆر ماندووبوونیان چوون، تا لای پێغەمبەر(ﷺ) سکاڵا بکەن لەسەر ناڕەحەتی ماندووبوونیان، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) لەبری ئەوەی خزمەتکاریان بۆ دابنێت نزای خێری فێرکردن، ئەوە بوو لەدوای

ئەوە ئیتر سەختی و نارەحەتییان لەسەر نەما، چونکە بەردەوام ئەو نزایەیان دەکرد.

بەوجۆرە (فاطمة) لەناو دەوڵەتی ئیسلامی ناو (مدینة)دا ژیانی دەبردەسەر و نزیک بوو لە باوکی و بەردەوام سەردانی یەکتریان دەکرد، تا ئەوەی دواجار ڕۆژی ناخۆشی ڕووی کردە (فاطمة)، ئەویش ماوەی نەخۆشی و ڕۆژی کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) بوو.

ئەوە بوو پێغەمبەر(ﷺ) نەخۆش کەوت، ئیتر (فاطمة) بەردەوام لەلای بوو و خزمەتی دەکرد و خەفەتی بۆ دەخوارد، لە ڕۆژی وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ)دا (فاطمة) کە نزیک بوو لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کاتێک دەگریا پێغەمبەر(ﷺ) چپەیەکی بۆ کرد و پێی فەرموو: کە دەمرێت، ئیتر (فاطمة) تەواو دەستی کرد بە گریان، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) چپەیەکی تری بۆ کرد و پێی فەرموو: لە کەسوکارمدا تۆ یەکەم کەسیت پێمدەگەیتەوە، (فاطمة)ش بزەیەکی کرد و پێکەنی، ئەوە بوو دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) هێندەی نەبرد دوای شەش مانگ لە وەفاتی باوکی، (فاطمة)ش نەخۆش کەوت.

پێشەوا (علي) خزمەتی (فاطمة)ی دەکرد، هەروەها پێشەوا (أبوبکر)یش ژنەکەی خۆی نارد بۆ لای (فاطمة)، تا لەو ماوەیەدا خزمەتی (فاطمة) بکات و ئاگای لێی بێت، پێشەوا

(أبـوبکر) کە خەلـیفە بـوو خۆیشـی دەچـوو بـۆ لای و سـەردانی دەکـرد، موسـڵمانانیش سـەردانیان دەکـرد، بەڵام دوای چەنـد ڕۆژێـک لە نەخۆشـیەکەی (فاطمـة) کـۆچی دوایـی کـرد و گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاری.

**پەند و ئامۆژگاری**

١- هەرچەندە کەسە نزیکەکانمان بمرن و بەجێمان بهێڵن، بەڵام ئەگەر کردەوەمان چاک بێت لە ڕۆژی دواییدا پشت بە خوا پێیان دەگەینەوە.

٢- مردن ڕاستیەکە هیچ کەس ناتوانێت لە دەستی ڕابکات.

**پرسیارەکان:**

١-دایک و باوک و خوشک و برای (فاطمة) کێ بون؟

٢- (فاطمة) چۆن موسڵمان بوو؟

٣- ناوی منداڵەکانی (فاطمة) چی بوون؟

٤- ڕۆژی نارەحەتیەکەی (فاطمة) کەی بوو؟

٥- باسی مردنی (فاطمة) بکە.

٦- ئەگەر ئێستا لای (فاطمة) بوویتایە چیت پێ دەوت؟

## ٢٩- (أنس بن مالك)

(أنس بن مالك) ئەو هاوەڵە خۆشەویستەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو کە ماوەیەکی زۆر خزمەتی پێغەمبەری خوای دەکرد، پێغەمبەریش (ﷺ) نزای بۆ کرد: خوایە، سامان و منداڵی زیاد بکە و بەرەکەتی تێبخە بۆی. ئیتر یەکپارچە شارەزای چرکە ساتەکانی ژیانی بوو، بە تاسەوە سوننەتەکانی وەردەگرت.

(أنس) منداڵێکی بچووک بوو، باوکی ناوی (مالک) بوو. (مالک) کەسێکی بێباوەڕ و خوانەناس بوو، زۆر ڕەق و توند بوو، لەگەڵ ئیسلامدا نەدەگونجا.

دایکی (أنس)یش ناوی (أم سولیم) بوو، ئەم ئافرەتە موسڵمان بوو بوو، بەڵام (مالک)ی مێردی زۆری لێدەکرد، تا واز بهێنێت لە ئیسلام، بەڵام ئەو ئافرەتە لەسەر ئایینی ئیسلام بەردەوام بوو و ئامادە نەبوو وازبهێنێت.

ڕۆژێکیان (مالک) تووڕە بوو، لەخۆیەوە بە ژن و منداڵدا هەڵدەشاخا، بەو تووڕەییەوە چوویە دەرەوە، لە ڕێگەیدا تووشی بوو بە تووشی یەکێک لە دوژمنەکانییەوە و لەگەڵیدا بووی بە شەڕ و ئەو دوژمنەش (مالک)ی کوشت، بەوەش (أنس) هەتیو کەوت.

بەڵام دایکی لەبەرئەوەی ژیر و باوەڕدار و خواناس بوو هێندە ئاگای لە (أنس) بوو نەیدەهێشت بۆ ساتێکیش (أنس) هەست بە بێباوکی بکات، بەڵکو بەردەوام فێری ئیسلامی دەکرد و خۆشەویستی خوا و پێغەمبەری خوای لە دڵیدا دەچاند.

ئیتر (أنس) تەواو تامەزۆری دیداری پێغەمبەری خوا بوو، بەڵکو خوازیار بوو کەمێک گەورە بێت و بچێت بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و بەردەوام لە خزمەتیدا بێت.

هێندەی نەبرد هەواڵ گەیشتە (مدینة) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی داوە بە هاوەڵان کۆچ بکەن بۆ (مدینة). ئیتر (أنس) لە خۆشیدا نەیدەزانی چی بکات، چونکە دەیزانی ئیتر پێغەمبەریش (ﷺ) دێت بۆ (مدینة).

ڕۆژانە (أنس) لەگەڵ خەڵکەکەدا دەچوویە دەرەوەی (مدینة) و چاوەڕێی هاتنی پێغەمبەری خوای دەکرد، تا ئەوەی ڕۆژی هاتنی پێغەمبەر (ﷺ) هات، ئیتر هەمووان بە تاسەوە چاویان لەڕێ بوو، ئەوە بوو پێغەمبەر (ﷺ) هات و خەڵکی بە جوانی پێشوازییان لێکرد.

دوای ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە (مدینة) نیشتەجێ بوو (أم سلیم) دەستی (أنس)ی گرت و هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و سەلامی کرد و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم کوڕەمم هێناوە، تا خزمەتت بکات دەی نزای خێریشی بۆ بکە، پێغەمبەریش(ﷺ) نزای بۆ کرد و فەرمووی: (خوایە، سامان و منداڵی زیاد بکە) ئەوکات (أنس) تەمەنی بیست ساڵ بوو.

ئیتر بەردەوام (أنس) لە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)دا بوو و هەر ئەرک و کارێکی پێغەمبەری خوا هەبوایە، ئەو ڕایدەپەڕاند.

(أنس) زۆر سەرسامی بۆن و ڕەنگ و کردار و گوفتاری پێغەمبەر(ﷺ) بوو، جار هەبوو پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ (أنس) دەچوو بۆ ماڵی دایکی (أنس) و سەردانیان دەکرد.

ڕۆژێکیان پێغەمبەر(ﷺ) (أنس)ی نارد بۆ ئیشێک، (أنس) چوو و ئیشەکەی کرد، دواتر چوویەوە بۆ لای دایکی، دایکی پرسیاری لێکرد بۆچی دواکەوتی؟ وتی: پێغەمبەر(ﷺ) ئیشی پێم هەبوو، وتی ئیشەکەی چی بوو؟ وتی: ئەوە نهێنی پێغەمبەری خوایە و باسی ناکەم، دایکی وتی: ئافەرین کوڕم هەرگیز نهێنی پێغەمبەر(ﷺ) باس نەکەیت.

(أنس) باسی ژیانی خۆی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد و دەیوت دە ساڵ لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)دا ژیام تەنها یەک جاریش لێم تووڕە نەبوو، بەڵکو هەمیشە پێغەمبەر(ﷺ) بە ڕووی خۆش و بە نەرم و نیانی قسەی لەگەڵ (أنس) کردووە، ، ئەگەریش (أنس) هەڵەیەکی هەبوایە، پێغەمبەر(ﷺ) تەریقی نەدەکردەوە، بەڵکو بە نەرمونیانی تێیدەگەیاند.

**پەند و ئامۆژگاری:**

١- پێویستە بە خۆشحاڵییەوە خزمەتی زانا و خواناسان بکەین و زانستیان لێوەرگرین.

٢- پێویستە هەمیشە نهێنی و شتە تایبەتیەکانی دەوروبەرمان

بپارێزین بەتایبەت نهێنی زانا و مامۆستاکانمان وەک چۆن (أنس) بە چاکی نهێنی پێغەمبەری (ﷺ) دەپاراست.

بەوجۆرە (أنس) بەردەوام لە ماڵ و لە دەرەوە و لە سەردان و شوێنەکاندا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا بوو، تا ئەو کاتەی پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کرد، ئیتر ئەو ڕۆژە سەختتریین ڕۆژی ژیانی (أنس) بوو.

دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) (أنس بن مالک) هەشتا و ئەوەندە ساڵ ژیا، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) نزای تەمەن درێژی بۆ کردبوو، ئەمەش بۆ موسڵمانان سوودی زۆر بوو، چونکە هەرکات موسڵمانان کێشەیەکیان هەبوایە، یان پرسیارێکیان بهاتایەتە ڕێ خێرا دەچوون و پرسیاریان دەکرد لە (أنس).

لەو ماوەی ژیانیدا هەرکات باسی هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ (مدینة) بکرایە (أنس) دڵخۆش دەبوو، بەڵام کاتێک باسی کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) دەکرا دەستی دەکرد بە گریان و تەواو دڵگران دەبوو.

زۆربەی کات و ژیانی (أنس) بریتی بوو لە پەرستش و یادی خوا، زۆرجار هێندە نوێژی دەکرد، تا قاچەکانی دەئاوسان، بەردەوام خەتمی قورئانی دەکرد و ژن و منداڵەکەی خۆی کۆدەکردنەوە و نزای بۆ دەکردن.

(أنس) هێندەی تامەزرۆی ئەوە بوو جارێکی تر پێغەمبەر(ﷺ) ببینێتەوە و لەگەڵیدا بژیت هەموو شەوێک خەوی پێوە دەبینی، (أنس) خۆی دەڵێت: هەموو شەوێک لە

خەومدا پێغەمبەر(ﷺ) دەبینم، دوای ئەم قسەش دەستی کرد بە گریان لەبەر دووری لە دیداری پێغەمبەر(ﷺ).

(أنس) لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشدیندا ڕێزێکی زۆری لێدەگیرا، بەردەوام خەڵکی سەردانیان دەکرد و پرسیاریان لێدەکرد، ئەویش بەسەرهاتی خۆی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا بۆ دەگێڕانەوە، چونکە لەناو هاوەڵاندا (أنس) لە هەموان زیاتر شارەزای هەڵسوکەوتی پێغەمبەر(ﷺ) بوو.

ئەو باسی ئەوەی دەکرد لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا بە شەقامەکانی (مدينة)دا گەڕاون و پێغەمبەر(ﷺ)کە داویەتی بە لای منداڵاندا سەلامی لێکردون و هەواڵی پرسیون، قسەی خۆشی بۆ کردون و ناڕەحەتی لەسەرشان لابردون.

دوای تەمەنێکی پڕ لە زانست و ئەزموون و پەرستش و خواناسی (أنس بن مالك)یش کاتی ئەوەی هات ژیانی دنیا بەجێبهێڵێ و ڕووەو لای پەروەردگاری بگەڕێتەوە و جارێکی تر بچێتەوە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی کۆچ کردوو، ئەوە بوو دوای تەمەنێکی زۆر و بوونی نەوەیەکی زۆر دواجار کۆچی دوایی کرد.

## پەند و ئامۆژگاری

١- هەوڵ بدەین هەردەم لەگەڵ زانایان و خواپەرستان و کەسانی چاکدا ژیان ببەینە سەر و لێیان دوور نەکەوینەوە، تا زیاترین ئەزموون و زانستیان لێ وەربگرین.

٢- دەبێت وەک (أنس) بە بیستنی کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) دڵگران بین و تامەزۆری دیداری پێغەمبەر(ﷺ) بین.

٣- دەبێت زۆر ڕێزی بچووکتر لە خۆمان بگرین، ئەوەتا پێغەمبەر(ﷺ) کەگەورەی مرۆڤایەتیە لەگەڵ منداڵاندا وەستاوە و سەلامی لێ کردون و هەواڵی پرسیون و قسەی بۆ کردون.

## پرسیارەکان

١- باوکی (أنس) چۆن بوو؟ ئەی چۆن مرد؟

٢- (أنس) چۆن چوویە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)؟

٣- نزاکەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ (أنس) چی بوو؟

٤- نهێنی پاراستنەکەی پێغەمبەر(ﷺ) لەلایەن (أنس)ەوە باس بکە.

٥- (أنس) چەند ساڵ لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بوو؟

٦- (أنس) دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) چۆن دەژیا؟

٧- ، ئەگەر (أنس) ئێستا لای تۆ بوایە، پرسیاری چیت لێدەکرد؟

## ٣٠- (خباب بن الأرت)

هاوەڵێکی بەرز و بەڕێزی پێغەمبەری خوا (ﷺ) (خباب بن الأرت) بوو، ئەو هاوەڵە بەڕێزەی کە لە پێناو ئایینی خوادا چەندین ناڕەحەتی و سزای چەشت و بە ئاسنی گەرم داخ دەکرا.

(خباب) منداڵێکی جوان و ڕۆح سوک بوو، لە نێو کەسوکاریدا ژیانی دەبردە سەر و دەهات و دەچوو، لە نێو هۆزی بەنی تەمیمدا دەژیا، لەگەڵ منداڵان دەچوویە دەر و یاری دەکرد، لەگەڵ باوکی دەهات و دەچوو، لای دایک و باوکی خۆشەویستیەکی زۆری هەبوو.

ڕۆژێکیان (خباب) چوویە دەرەوە و لەگەڵ هاوڕێکانیدا یاری دەکرد، کەچی لە ناکاودا نەگبەتی ڕووی کردە ناوچەکەیان و دوژمنان هێرشیان بۆ هێنان و ژن و منداڵ و ئاژەڵەکانیان بردن، (خباب)یش یەکێ بوو لەو منداڵانەی کە دوژمنان بردنیان و وەک کۆیلە لە بازاڕی کۆیلە فرۆشاندا هەرزان فرۆشیان کردن.

ئیتر (خباب) هەر جارەو کۆیلەی کەسێک بوو و خزمەتی بە

کەسێک دەکرد و زۆر ماندوو دەکرا، جارێکیان گەورەکەی (خباب) بڕیاری دا بیبات بۆ (مكة) و بیفرۆشێت، (خباب)یش تەنها دەبوو ملکەچی فەرمانی بێت، ئەوە بوو (خباب)ی برد و لە (مكة)دا هەرزان فرۆشی کرد.

پرسیار: کێ، (خباب)ی کڕی؟

وەڵام: ئافرەتێک هەبوو ناوی (أم أنمار) بوو چوو بوو دەیویست کۆیلەیەک بکڕێت، کاتێک (خباب)ی بینی سەیری کرد لەشی ساغە و ژیر دیارە، بۆیە کڕی و بردیەوە بۆ ماڵەوە و بۆ کار و خزمەتی خۆی بەکاری دەهێنا.

(أم أنمار) ئافرەتێکی خوانەناسی بتپەرستی زۆر خراپ بوو، ئیشی سەختی دەکرد بە (خباب)، کاتێک کەمێک (خباب) گەورە بوو ئەو ئافرەتە چوو بۆ لای ئاسنگەرێک و داوای لێکرد (خباب) وەک شاگرد وەربگرێت، ئەویش ڕازی بوو.

ئیتر (خباب) ڕۆژانە دەچوو بۆ لای ئەو ئاسنگەرە و لای ئەو فێری دروست کردنی شمشێر بوو، هێندە بە جوانی فێر بوو کە دروست کردنی شمشێری (خباب) لەناو خەڵکیدا باس دەکرا. ئەمە وایکرد (أم أنمار) بیر لەوە بکاتەوە دووکانێکی تایبەت بۆ (خباب) دابنێت، تا پارەی زیاتری بۆ پەیدا بکات، ئەمەش هێندەی تر ئیشەکەی ئەو کوڕەی قورستر کرد.

هەر لە سەرەتای دەرکەوتنییەوە خەڵکی زۆر سەرسام بوون بە

ئاکاری جوان و ژیری و قسە جوانی (خباب) و زۆر متمانەیان پێی هەبوو، بەوەش زۆربەی خەڵک بۆ پێویستیەکانیان دەچوون بۆ لای ئەو.

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) هات دەنگ و باس لەناو خەڵکدا بڵاوبوویەوە کەگەنجێک دەرکەوتووە بە ناوی (محمد) و دەڵێت: پێغەمبەرم. (خباب) کە ئەمەی بیست تەزوو هات بە لەشیدا و هەستی کرد ئەمە قسەیەکی گاڵتە نییە.

پێشەوا (أبوبکر) بوو بە ڕێنیشاندەری (خباب). (خباب)یش خێرا چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و لە خزمەتیدا دانیشت کە پێغەمبەری خوای بینی و گوێی لێگرت چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسک و دەستی خستە دەستی پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند، بەوەش (خباب) بوو بە شەشەم موسڵمانی سەر زەوی خوا.

**پەند و ئامۆژگاری:**

١- دەبێت بە تەمبەڵی دانەنیشین و چالاکانە ئیش بکەین و یارمەتی دایک و باوک و کەسەکانمان بدەین.

٢- دەبێت هێندە ئاکار و ڕەوشتمان جوان بێت هەمووان تامەزرۆی ئەوە بن هەڵسوکەوتمان لەگەڵ بکەن و لایان خۆشەویست بین.

بەرەبەرە هەواڵی موسڵمان بوونی (خباب) بڵاوبوویەوە، هەر کە (أم أنمار) ئەوەی بیست خێرا چوو بۆ لای (سیباع)ی برای، ئەویش بە کۆمەڵێک گەنجەوە لەگەڵ (أم أنمار)دا کەوتە ڕێ و هاتن بۆ لای (خباب)، بە توندی لێیان دەدا و سزایان دەدا، جلی ئاسنینیان لەبەر دەکرد و لەبەر خۆردا دایان، دەنا، ئاویان پێنەدەدا و زۆر سزایان دەدا و داوایان لێ دەکرد قسە بڵێ، بە پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵام (خباب) ئامادە نەبوو بە گوێیان بکات.

هێندە بە سەختی سزای (خباب)یان دەدا، تا جارێکیان (خباب) لە ڕێی ئیشەکەیەوە چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا نزای سەرکەوتنمان بۆ ناکەیت؟

پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: (پێش ئێوە کەس هەبووە چاڵی بۆ هەڵکەنراوە و خراوەتە ناوی و دواتر بە مشار لەسەرەوە، تا خوار لەتیان کردووە، بەخوا خوای گەورە ئەم ئایینە سەردەخات...، بەڵام ئێوە پەلە دەکەن).

بۆیە (خباب) گەڕایەوە و بڕیاری دا دووبارە خۆڕاگر بێت، تا خوای گەورە سەریان دەخات.

جارێکیان (خباب) شمشێرێکی دروست کرد بۆ کابرایەکی بێباوەڕ کە ناوی (عاص بن وائل) بوو، کاتێک (عاص) هاتەوە و شمشێرەکەی برد (خباب) داوای پارەکەی کرد. (عاص) وتی: پارەت پێ نادەم، تا وازنەهێنی لە ئایینەکەی (محمد).

(خباب)یش وتی: تا مردنیش بە تەمای ئەوە بیت من هەرگیز واز ناهێنم لە ئایینی (محمد).

هێندەی نەبرد خوای گەورە سزای خۆی نارد بۆ (أم أنمار) و حەقی (خباب)ی سەندەوە، ئەوە بوو (أم أنمار) تووشی ژانە سەرێک بوو کە نموونەی وا لە کەسدا نەبینرا بوو، دەبوو بۆ کەمکردنەوەی ئازاری سەری ئاسن داخ بکرایە و بدرایە لەسەری، کوڕ و کەسەکانی بەردەوام بۆ پزیشک دەگەڕان، بەڵام هەموو پزیشکەکان دەیانوت تەنها چارەسەری ئەوەیە بە ئاسنی گەرم سەری داخ بکەن، بەوەش خوای گەورە تۆڵەی (خباب)ی لەو ئافرەتە سەندەوە.

**پەند و ئامۆژگاری:**

١- دەبێت لە پێناو خوادا بەرگەی هەموو سەختی و ئازارێک بگرین و لەوەشدا منەت نەکەین، بەڵکو ئەوە ئەرکی ئێمەیە. وەک چۆن پێغەمبەر(ﷺ) پێی ڕاگەیاندین پێش ئێمە خەڵکی زۆر بە سەختی لەسەر ڕێبازی خوا سزا دراون.

٢- خوای گەورە تۆڵە لە ستەمکار دەکاتەوە و مافی ستەملێکراو وەردەگرێتەوە، بەڵام دەبێت پەلە نەکەین.

پێغەمبەر(ﷺ) کە بینی هاوەڵانی زۆر سزا دەدرێن بڕیاریدا

هاوەڵان کۆچ بکەن بۆ (مدینة)، (خباب)یش ویستی کۆچ بکات، بەڵام لەبەر نەخۆشی (أم أنمار) ناچار مایەوە و دەبوو ڕۆژانە ئاسن گەرم بکات و سەری ئەو ئافرەتە داخ بکات.

بەڵام دوای ماوەیەکی کەم کۆچی کرد بۆ (مدینة) و لە دەست ئەو کەسە خراپ و ناپاکانە ڕزگاری بوو، ئیتر بەردەوام لە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)دا دەبوو و زانستی لێوەردەگرت و بە بینینی ڕوخساری پیرۆزی پێغەمبەر(ﷺ) ئازارەکانی بیر نەدەمان.

لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا بەشداری غەزاکانی دەکرد، لە جەنگی بەدر و ئوحودیشدا بەشداری کرد، لە جەنگی ئوحوددا بینی (سباع)ی برای (أم أنمار) کە سزای ئەوی دەدا لەسەر دەستی پاڵەوانی ئیسلام (حمزة)ی مامی پێغەمبەر(ﷺ) کوژرا.

بەوجۆرە (خباب) هەموو ماوەی ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) لە (مدینة)دا لە خزمەتیدا بوو، چ لە غەزاکان چ لە مزگەوت و کاتی نوێژ و جەژنەکان و کاتەکانی تریشدا، تا ئەو کاتەی ڕۆژی وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) هات ئیتر یەکپارچە ئازار و دڵگرانی (خباب)ی داگرت، بەڵام خۆڕاگرانە بڕوای بەوە هەبوو، دەبێت هەموومان بگەڕێینەوە بۆ لای خوا.

(خباب) لە سەردەمی خەلیفەکانی پێغەمبەر(ﷺ)دا ژیا و خەلیفەکان و هاوەڵانیش زۆر ڕێزیان دەگرت. جارێکیان چوو بۆ

لای (عمر بن الخطاب)، باسی بەسەرهاتی خۆی بۆ کرد کە بێباوەڕان ئاگرێکیان بۆ کردۆتەوە و خستوویانەتە سەر ئاگرەکە و بێباوەڕێک قاچی لەسەر سنگی داناوە، تا بە تەواوی پشتی بسووتێت، دواتر پشتی خۆی نیشانی پێشەوا (عمر)دا و پێشەوا (عمر)یش دەستی کرد بە گریان.

دوای تەمەنێکی زۆری پڕ لە خزمەتکردن بە ئایینی خوا (خباب) بە نەخۆشی لە تەمەنی حەفتا و سێ ساڵیدا لە (كوفة) مرد و پێشەوا (علي) نوێژی لەسەر کرد و لە (كوفة) تەرمەکەی ئەسپەردە کرا.

**پەند و ئامۆژگاری:**

١- خوا ناهێڵێت ستەمکار بێ تۆڵە لە ژیان دەرچێت وەک چۆن بە بەرچاوی (خباب)ەوە سزای سیباعی دا.

٢- گەورەترین خەفەت و ئازاری هەر موسڵمانێک، دەبێت مردنی پێغەمبەر(ﷺ) بێت.

**پرسیارەکان:**

١- (خباب) چۆن کرا بە کۆیلە؟

٢- (أم أنمار) کێ بوو؟

٣- (خباب) چۆن موسڵمان بوو؟

٤- چۆن خوا مافی (خباب)ی سەندەوە؟

٥- باسی سزای خوا بۆ سەر (أم أنمار) بکە.

٦- چیرۆکەکەی (خباب) بۆ (عمر) چی بوو؟

٧- دەتوانیت وەک (خباب) خۆڕاگر بیت؟

## ٣١- (حمزة بن عبد المطلب)

(حمزة) مامی پێغەمبەری خوا و گەورە هاوەڵی خۆشەویست و برای شیری پێغەمبەری خوا و شێری خوا و پێغەمبەرەکەی و گەورەی شەهیدانە، ئەو کەسایەتیە خۆشەویستی پێغەمبەری خوایە (ﷺ).

(حمزة بن عبد المطلب) و برای (عبدالله) بوو، (عبدالله)ش باوکی پێغەمبەری خوا بوو. واتە: (حمزة) مامی پێغەمبەری خوا بوو، هەروەها یەک ئافرەت شیری داوە بە (حمزة) و پێغەمبەری خواش کە ناوی ئەو ئافرەتە (ثويبة) بوو. بەو پێیە (حمزة) و پێغەمبەر(ﷺ) برای یەکترن، هەروەها تەمەنی (حمزة) لەگەڵ تەمەنی پێغەمبەر(ﷺ) لە یەکەوە نزیک بوو.

پێغەمبەر(ﷺ) زۆر (حمزة)ی خۆشدەویست و بە چاوی ڕێز و گەورەییەوە سەیری دەکرد، (حمزة)ش بە هەمان شێوە زۆر پێغەمبەری خوای خۆش دەویست.

(حمزة) لەناو شاری (مكة)دا کەسێکی ناودار بوو و زۆر ئازا

و دلێر بوو، هەر کە ناوی (حمزة) بهاتایە کەس نەیدەوێرا بەرانبەری بوەستێت، هەروەها زۆر ڕێزی لێدەگیرا و قسەی لای هەمووان گرنگ بوو، ئیتر وەک سەرکردەیەکی دیاری ناو ئەو شارە وابوو.

هەروەها (حمزة) لە تیرهاویشتندا ناوبانگی هەبوو و زۆر حەزی لە ڕاوکردن بوو، زۆربەی ڕۆژەکان دەچوو بۆ دەرەوەی شار بۆ ڕاوکردن و تا ئێوارە لەوێ سەرقاڵی ڕاوکردن دەبوو، ئینجا ئێوارە دەگەڕایەوە.

ڕۆژان دەچوون و ژیان لە (مكة)دا بەو شێوە بەردەوام بوو، تا پێغەمبەر(ﷺ) کەوتە گەیاندنی پەیامی خوا بە خەڵک و بێباوەڕانیش بە سەختی دژایەتییان دەکرد، (حمزة)ش ئاگاداری بوو نەوەک زیانێکی پێ بگەیەنن، بەڵام هێشتا موسڵمان نەبوو بوو. بەڵام خوای گەورە دواجار هۆکارێکی ڕەخساند، تا (حمزة) موسڵمان بێت. ڕۆژێکیان (حمزة) وەک جاران خۆی ئامادە کرد و چەکی هەڵگرت و چوویە دەرەوە بۆ ڕاوکردن.

پرسیار: چەکەکەی (حمزة) چی بوو؟

وەڵام: (حمزة) تیروکەوانی پێ بوو، چونکە بۆ ڕاو دەچوو نەک بۆ جەنگ.

(حمزة) چوو بۆ ڕاو، تا درەنگانێک سەرقاڵی ڕاوکردن بوو، لەو کاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) لە شوێنێک بوو کەپێی دەوترێت

(صفا)، (أبو جهل) هات و دای بە لای پێغەمبەری خوادا و قسەی ناشیرینی پێ وت: و بە قسەی نابەجێ پێغەمبەری خوای ئازاردا، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) هیچ وەڵامی نەدایەوە و بە دڵگرانی بەرەو ماڵەوە چوویەوە.

لەو کاتەدا ئافرەتێکی کۆیلە هەبوو گوێی لەو قسانە بوو، کاتێک (حمزة) گەڕایەوە وەک جاری جاران چوو بۆ لای کەعبە، تا تەوافی کەعبە بکات، لە ڕێگەیدا سەردانی کۆڕی دانیشتنی خەڵکی قوڕەیشی کرد، لەوێ لە لایەکەوە ئەو ئافرەتەی بینی، ئافرەتەکە وتی: ئەی (حمزة)، ئەگەر ئەتبینی چۆن (أبو جهل) لە (صفا)دا (محمد)ی ئازار دەدا و قسەی پێ دەوت و (محمد)یش وەڵامی نەدایەوە و چوویەوە بۆ ماڵەوە.

(حمزة) تووڕە بوو و زۆر بە تووڕەیی چوویە دەر، تا خۆی گەیاندە لای کەعبە و سەیری کرد لە دوورەوە (أبو جهل) دانیشتووە، (حمزة) بەرەو ڕووی چوو و بە کەوانەکەی بە توندی دای بەسەری (أبو جهل)دا و دواتر وتی قسە بە (محمد) دەڵێیت؟ مەگەر نازانیت من لەسەر ئایینی ئەوم و ئەو چی دەڵێت: من وا دەڵێم؟ دەی، ئەگەر پیاویت و هیچت پێ دەکرێ شتێك بکە.

بەوجۆرە (حمزة) لەبەرچاوی هەمووانداً موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند و خوای گەورەش هێندەی تر بەهۆی (حمزة)وە ئایینی ئیسلامی سەرخست و بێباوەڕانیش نەیانتوانی بەرانبەر بە (حمزة) هیچ شتێك بکەن.

**پەند و ئامۆژگاری:**

١- دەبێت هەوڵ بدەین ئازا و دلێر و نەترس بین، تا بتوانین ئەوە بۆ خزمەتی ئیسلام بەکار بهێنین وەک چۆن (حمزة) بەرانبەر بێباوەڕان دلێری نواند و موسڵمانانی سەرخست.

٢- نابێت بە هیچ جۆرێک ڕێگە بدەین کەس بە خراپە ناوی پێغەمبەر(ﷺ) بهێنێت و هەر کەس وایکرد، دەبێت تێی بگەیەنین ئەگەر بەردەوام بوو، دەبێت بە توندی ڕێی لێبگرین.

پاش ماوەیەکی زۆر مانەوەیان لە (مكة) بەهۆی ئەوەی بێباوەڕان وازیان نەدەهێنا لە ئازاردانی موسڵمانان بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاریدا موسڵمانان کۆچ بکەن بۆ (مدينة)، تا بتوانن لەوێ بەبێ ئازاردان بژین و دەسەڵاتێک دروست بکەن و لەوێوە بانگەوازی ئیسلامی بڵاوبکەنەوە.

لەنێو ئەو موسڵمانانەشدا کە کۆچیان کرد (حمزة)ش کۆچی کرد و هاتن لە (مدينة) نیشتەجێ بوون و چاوەڕێی هاتنی پێغەمبەری خوایان دەکرد، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) هات بە گەرموگوڕی و خۆشحاڵییەوە پێشوازییان لێکرد.

پێغەمبەر(ﷺ) خەڵکە موسڵمانەکەی (مكة) و (مدينة)ی کردن بە برای یەکتر، بەوجۆرە (حمزة) و (زيد بن حارثة) بوون

بە برای یەکتر و هەموو شتێکیان بۆ یەکتر دەبوو، پێکەوە ئیشیان دەکرد و پێکەوە بەرهەمیان دابەش دەکرد.

دوای ماوەیەک پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاریدا تۆڵە بکاتەوە لە قوڕەیش و هێزیان لاواز بکات، ئەوە بوو کاروانێکی قوڕەیشیەکان لە (شام)ەوە دەگەڕایەوە و (أبو جهل)یش لەناو ئەو کاروانەدا بوو، بێباوەڕەکان سێ سەد کەس بوون، کاتێک گەیشتە ناوچەیەک کە پێی دەوترا سەیفولبەحر پێغەمبەر(ﷺ) (حمزة بن عبد المطلب)ی لەگەڵ کۆمەڵێک موسڵماندا نارد، تا ڕێ نەدەن بێباوەڕەکان بگەڕێنەوە بۆ (مكة).

پرسیار: ئەمە لە چ کاتێکدا بوو؟

وەڵام: ئەمە لە مانگی ڕەمەزانی یەکەم ساڵی کۆچ کردنی پێغەمبەر(ﷺ) دا بوو.

(حمزة) و موسڵمانەکان ڕێیان گرت بە (أبو جهل) و بێباوەڕەکانی قوڕەیش، بەڵام کەسێک بە ناوی (مجد)ی هات و کەوتە نێوانیان و نەیهێشت جەنگ بکەن، بۆیە هەر کامیان بەڕێی خۆیاندا چوون.

بەڵام (حمزة) داخی دڵی بەرانبەر بێباوەڕان زۆر بوو و چاوەڕێی دەرفەتێک بوو، تا تۆڵەی ئەو ستەمەیان لێ بکاتەوە، ئەوەبوو جەنگی بەدر هاتە ڕێ و پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ ژمارەیەک لە هاوەڵاندا لە بەدردا بەرانبەر بە بێباوەڕان

وەستانەوە، ئەوەش یەکەم جەنگی ڕاستەوخۆی نێوان موسڵمانان و بێباوەڕان بوو.

پێغەمبەر(ﷺ) سوپای موسڵمانانی بە چاکی ئامادە کرد و نزای خێری بۆ کردن، بێباوەڕانیش ژمارەیان سێ بەرانبەری موسڵمانەکان بوو، بێباوەڕەکان داوایان کرد، سەرەتا سێ موسڵمان بەرانبەر بە سێ بێباوەڕ بجەنگن، ئەوە بوو پێغەمبەر(ﷺ) (حمزة) و (عبیدة بن حارث) و (علي بن أبو طالیب)ی نارد، بێباوەڕەکانیش بریتی بوون لە (عتبة) و (شیبة) و (ولید).

خێرا (حمزة) هەڵمەتی برد و (شیبة)ی کوشت، ئەمەش یەکەم سەرکەوتنی موسڵمانان بوو، ئینجا (علي)ش هەڵمەتی برد و (ولید)ی کوشت، ئەمەش بوو بە دووەم سەرکەوتنی موسڵمانان، ئینجا (أبو عبیدة) و (عتبة) یەکتریان بریندار کرد، خێرا (حمزة) و (علي) دایان لە (عتبة)، بەمەش موسڵمانان سەرکەوتن، ئینجا جەنگ ڕوویدا و تیایدا (حمزة) دلێرییەکی بێوێنەی نواند و لەئەنجامدا موسڵمانان سەرکەوتن و بێباوەڕان شکان.

**پەند و ئامۆژگاری:**

١- دروست کردنی دەسەڵاتی ئیسلامی بۆ پەیڕەوکردنی فەرمانی خوا ئەرکی هەموانە وەک چۆن هاوەڵان و پێغەمبەر(ﷺ)کۆچیان کرد بۆ (مدینة) تا لەوێوە فەرمانی خوا بچەسپێنن.

٢- موسڵمان ویستی جەنگ و ستەمی نییە، بەڵام ئەگەر ستەمی لێکراو لێیدرا، دەبێت زۆر بە هێزانە دوژمن تێکبشکێنێت، وەک چۆن پێغەمبەر(ﷺ)و هاوەڵان لە بەدردا وایانکرد.

بێباوەڕان ئەم شکستەیان لەبیر نەچوو، بۆیە خۆیان کۆکردەوە و هەمتر هاتنەوە بۆ جەنگ، ئەوە بوو جەنگی ئوحود لەنێوان موسڵمانان و بێباوەڕاندا ڕوویدا.

ئافرەتێک بە ناوی (هند) کەسێکی بەناوی (وحشي) دانابوو، تا (حمزة) بکوژێت (حمزة) لە سەرەتاوە زۆر دلێرانە جەنگا و ژمارەیەک بێباوەڕی کوشت و گورزی سەختی وەشاند لە بێباوەڕان.

بەڵام (وحشي) ڕمێکی وەشاند و دای لەسەر سنگی (حمزة) و شەهیدی کرد، ئینجا دوای جەنگەکە ئافرەتەکە چوو و سکی

(حمزة)ی هەڵدڕی و جگەر و دڵی دەرکرد و تەرمەکەی شێواند، پێغەمبەر(ﷺ) زۆر بەوە دڵگران و بێتاقەت بوو و (حمزة)ی بە گەورەی شەهیدان دانا.

## پەند و ئامۆژگاری:

دەبێت لە پێناو ئیسلامدا هەموو شتێکمان بکەین بە قوربانی، تەنانەت ئەگەر شەهید بوونیشتمان بێت لە پێناو خوادا.

**پرسیارەکان**

١-خزمایەتی (حمزة) و پێغەمبەر(ﷺ) چی بوو؟

٢- (حمزة) چۆن موسڵمان بوو؟

٣- موسڵمانان بۆچی کۆچیان کرد بۆ (مدینة)؟

٤- باسی ڕۆڵی (حمزة) بکە لە جەنگی بەدردا.

٥- (حمزة) چۆن شەهید کرا؟

٦- دەتوانیت بەسەرهاتی (حمزة) بۆ کەسێک باس بکەیت؟

# ٣٢- (أسماء بنت أبوبكر)

(أسماء) ئەو ئافرەتە هاوەڵەی پێغەمبەری خوا و ژنە خواناسە بوو کە کچی خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) و خوشکی دایکی باوەڕداران و ژنی یەکێک لە گەورە هاوەڵان و دایکی یەکێک لە گەورە هاوەڵە خواناسەکان بوو، ئەو ئافرەتە بوو کە لای پێغەمبەر(ﷺ) زۆر بەڕێز بوو و پێغەمبەری خوا مژدەی بەهەشتی پێدا کاتێک فەرمووی: لەبری ئەو دوو پشتێنەت، لە بەهەشتدا خوا پاداشتت دەداتەوە.

(أسماء) کچی (أبوبكر الصديق)بوو، (أبوبكر الصديق)یش هاوڕێی نزیک و خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) و دواتریش خەلیفەی یەکەمی موسڵمانان بوو. ئەو (أبوبكر)ەی کە لە قورئاندا باسی کراوە و پێغەمبەریش(ﷺ) مژدەی بەهەشتی پێدا و هەموو هاوەڵانیش بە گەورەی خۆیان سەیریان دەکرد.

کاتێک (أبوبكر الصديق) هەواڵی بیست پێغەمبەری خوا بووە بە پێغەمبەر بەبێ دوودڵی و ڕاڕایی باوەڕی پێهێنا و بوو بە یەکێک لە گەورەترین بانگەوازکەران بۆ ئایینەکەی خوا، ئیتر چەندین کەس لەسەر دەستی پێشەوا (أبوبكر) موسڵمان دەبوون،

یەکێک لەو کەسانەش کە موسڵمان بوو (أسماء)ی کچی بوو.

(أبوبکر) دەستی (أسماء)ی گرت و بردی بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە (أسماء)ی کچمە هێناومە دەیەوێت موسڵمان بێت، (أسماء)ش لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)دا موسڵمان بوو و بەوپەڕی خۆشحاڵیەوە بوو بە یەکێک لە بەرگریکارانی ئیسلام.

پێشەوا (أبوبکر) کەسێکی ناودار و ناسراوی ناو (مکة) بوو و سامانی زۆریشی هەبوو، بۆیە (أسماء) و خوشک و ماڵ و منداڵیشیان لە خۆشیدا دەژییان، هاوکات باوکی (أبوبکر) هێشتا مابوو و نەمردبوو، (أسماء)یش زۆر بە چاکی خزمەتی دەکرد، چونکە باپیری بوو، دەیزانی ڕۆژێک دێت ئەویش دەچێت بەتەمەندا و بە ئەرکێکی ئایینی دەزانی تا خزمەتی باپیری بکات هەرچەندە باپیری موسڵمان نەبووبوو.

پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژانە جارێک، یا دووجار دەچوو بۆ ماڵی پێشەوا (أبوبکر)، تا بیبینێت بەوەش (أسماء) ڕۆژانە پێغەمبەری خوای دەبینی، ئیتر (أسماء) هەمیشە نزیک بوو لە دوو کەسی زۆر گەورە و خواناسەوە، یەکەمیان پێغەمبەری خوا(ﷺ)، دووەمیشیان (أبوبکر)ی باوکی.

بەمجۆرە ڕۆژان دەهاتن و دەچوون، تا ئەو کاتەی پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتی دا بە موسڵمانان کۆچ بکەن بۆ (مدینة)، دواتر پێغەمبەر(ﷺ) و پێشەوا (أبوبکر) بڕیاریاندا کۆچ بکەن، لەو کاتەدا (أسماء) کەوتە ئامادەکردنی توێشوو و

کەلوپەل بۆیان، دوایی ویستی کەلوپەلەکەیان بۆ بپێچێتەوە هیچی بۆ ئەوە شک نەبرد، بۆیە پشتوێنەکەی خۆی لێکردەوە و کردی بە دوو لەتەوە و هەردوو توێشووەکەی پێچایەوە. ئیتر (أسماء) بە خاوەن دوو پشتوێنەکە ناسرا، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) موژدەی پێدا لەبری ئەوەدا خوای گەورە لە بەهەشتدا دوو پشتوێنی پێ دەبەخشێ.

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) و پێشەوا (أبوبكر) کۆچیان کرد، بێباوەڕان دەگەڕان بە شوێنیاندا، تا بیانگرن، بەڵام ئەوان تازە لە شار دەرچووبوون. (أبو جهل) و بێباوەڕەکان هاتنە بەردەرگای ماڵی (أبوبكر) و تەقەیان دا لە دەرگا، (أسماء) هاتەدەر و وتی: چیتان دەوێت؟

وتیان: کوا باوکت؟

وتی: من چووزانم؟

خێرا (أبو جهل)ی گومڕا زللەیەکی توندی لێدا، ئەمە لە کاتێکدا ئەوکات (أسماء) سکی پڕ بوو بە (عبدالله)ی منداڵیەوە.

پرسیار: ئایا ئەوکات (أسماء) شووی کردبوو؟

وەڵام: بەڵێ. (أسماء) پێشتر شووی کرد بوو بە یەکێک لە هاوەڵە بەڕێزەکان کە (زبير بن العوام) بوو، لەو مێردەی سکی کرد بە (عبدالله)وە کە دواتر (عبدالله) بوو بە هاوەڵێکی زۆر گەورە و خواناس و دوای خەلیفەکان بوو بە سەرکردەی موسڵمانان.

دوای ئەوە (أسماء) لە ماڵ باوکی بوو، باپیری کە هێشتا موسڵمان نەبووبوو بە (أسماء)ی ووت، (أبوبكر) کە چووە هیچ پارەی بۆ بەجێهێشتووین؟ (أسماء)ش دەیزانی (أبوبكر) هیچی بەجێنەهێشتووە، بەڵام بۆ ئەوەی باپیری بێتاقەت نەبێ و قسە بە باوکی نەڵێت ووتی: بەڵێ، برێ وردە بەردی کردە ناو توورەکەیەک و وتی: ئەوە پارەیەی بۆ بەجێهێشتووین، باپیریشی لەبەرئەوەی نابینا بوو بێدەنگ بوو و وتی: باشە.

(أسماء) پاش ماوەیەک بڕیاری کۆچی دا و بە سکی پڕەوە کۆچی کرد بۆ (مدينة)، لە (مدينة) (عبدالله)ی کوڕی لەدایک بوو، ئەوەش یەکەم منداڵی کۆچەران بوو کە لە (مدينة) لەدایکبوو.

پرسیار: (أسماء) دوای چەند کەس موسڵمان بوو؟

وەڵام: (أسماء) حەڤدەهەم کەس بوو کە موسڵمان بووبوو.

بەوجۆرە (أسماء) لە (مدينة)شدا بە باوەڕ و خواناسیەوە ژیانی دەبردە سەر و هەردەم خزمەتی دەکرد، بە ئایینی خوا و ترسی نەبوو لە سەختیەکانی ژیان، بەڵکو هەموو سەختیەکی ژیانی قبول دەکرد، تەنها لەپێناو ئەوەی ڕەزامەندی خوا بەدەست بێنێت.

هەروەها (أسماء) خوشکی دایکی باوەڕداران (عائشة) بوو، (عائشة) ژنی پێغەمبەر(ﷺ) و دایکی باوەڕداران و خوشکی (أسماء) و کچی پێشەوا (أبوبكر) بوو، ئەمەش گەورەییەکی تر بوو بۆ (أسماء) کە خوشکێکی وای هەبێت.

(أسماء) زۆر بە جوانی (عبدالله)ی پەروەردە کرد و فێری بنەماکانی ئیمان و خواناسی دەکرد، ڕاستیەکانی ژیان و گەورەیی ئیسلامی فێردەکرد، قورئانی پیرۆزی پێ دەخوێند و پێی لەبەردەکرد، (عبدالله)ی دەبردە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و بە هەموو شێوەیەک هەوڵیدەدا بە جۆرێک ئەو کوڕەی پەروەردە بکات کە کەسێکی خواناس و چاک و گەورەی لێ دەربچێت.

(أسماء) بەوجۆرە ژیا. تا پێغەمبەری خواش(ﷺ) کۆچی دوایی کرد.

لە سەردەمی خەلیفە (أبوبکر)ی باوکیشیدا ژیا و هەوڵی دەدا یارمەتیدەری باوکی بێت، دواتر باوکیشی کۆچی دوایی کرد، لە سەردەمی پێشەوا (عمر) و پێشەوا (عثمان) و پێشەوا (علي) و پێشەوا (حسن)یشدا بەهەمان شێوە ژیا.

ئیتر بەرەبەرە کەسە ئازیز و بەڕێزەکانی بەجێیان دەهێشت و ئەویش بەرەو پیری دەچوو، (عبدالله)ی کوڕیشی بوو بوو بە پیاوێکی نموونەیی و خواناس و لەپێناو خوادا هەوڵی دەدا، (عبدالله) بوو بە سەرکردەی موسڵمانان لە (مكة) و (مدينة)دا.

بەڵام دواجار لە جەنگێکدا (عبدالله)ی کوڕی شەهید بوو، دایکیشی تەواو دڵگران بوو، چاوەکانیشی لەدەستدا بوون و کوێر بووبوو، ئەوەبوو دوای دە شەو لە کوژرانی کوڕەکەی ئەویش لە تەمەنێکی دوور و درێژی سەد ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

**پەند و ئامۆژگاری:**

١- دەبێت لە پێناو ئیسلامدا بەرگەی هەموو سەختی و نارەحەتیەکان بگرین.

٢- دەبێت بە چاکی و جوانی خزمەتی دایک و باوک و باپیر و دایەگەورەمان بکەین، چونکە ئەوە فەرمانی خوایە.

٤- پێویستە کاتێک کەسە ئازیزەکانمان دەمرن خۆڕاگر و سوپاسگوزار بین وەک چۆن (أسماء) وای دەکرد.

**پرسیارەکان:**

١- (أسماء) کچی کێ بوو؟

٢- (أسماء) کەی و چۆن موسڵمان بوو؟

٣- ناوی مێردەکەی (أسماء) چی بوو؟

٤- کۆچکردنی (أسماء) بۆ (مدينة) باس بکە.

٥- باسی مردنی (أسماء) بکە.

٦- ئایا حەز دەکەیت هێندەی (أسماء) تەمەنت درێژ بێت؟

# ٣٣- (أبو ذر الغفاري)

یەکێک لە گەورە هاوەڵانی خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) (أبو ذر الغفاري)ی بوو، هێندە لە خوا ترس و دنیانەویست بوو پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: کێ دەیەوێت سەیری خاکیبوونی (عیسی) بکات، با سەیری (أبو ذر الغفاري) بکات. (أبو ذر الغفاري)یش هەردەم لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)دا بوو و پشتی کردبوویە دنیا و لەوپەڕی خواپەرستیدا بوو.

(أبو ذر) لەناو هۆزی غیفاردا دەژیا، ئەو هۆزە لەناو خەڵکدا ناوبانگیان باش نەبوو و زۆربەی خەڵک لەو هۆزە بێزار بوون و بە چاوی خراپەوە سەیریان دەکردن.

پرسیار: بۆچی هۆزی غیفار ناوبانگیان باش نەبوو؟

وەڵام: چونکە ئەو هۆزە ناسرا بوون بە ڕێگر و جەردە، لەسەر ڕێدا دەوەستان و هەر کاروانێک بهاتایە ڕێیان لێدەگرت و شتێکیان لێ دەسەندن، ئەگەرنا هەرچییان پێبووایە لێیان دەبردن.

بەڵام (أبو ذر الغفاري) وەک هۆزەکەی نەبوو و ئەو کاتەش

لەسەر ئایینی جاران خواپەرستی دەکرد و بە تەنها دادەنیشت و سەرقاڵی بیرکردنەوە بوو، هەوڵی دەدا بەدوای جیهانێکی تردا بگەڕێت، جیهانی پڕ لە ئاسایش و ئاشتی و خۆشەویستی و برایەتی، جیهانێک تیایدا خۆشییەکان جێی ئازارەکان بگرنەوە، برایەتی جێی ڕێگری بگرێتەوە.

هێندەی نەبرد (أبو ذر الغفاري) هەواڵی بیست کەسێک بە ناوی (محمد) لە (مكة) بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکات. (أبو ذر)یش دڵخۆش بوو و هەستی کرد ئەمە ئەو جیهانەیە کە ئەو ئاواتی بۆ دەخوازێت، خێرا (أبو ذر) براکەی خۆی نارد بۆ (مكة)، تا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) قسە بکات، ئەویش چوو بۆ لای و قسەی لەگەڵ کرد و دواتر گەڕایەوە بۆ لای (أبو ذر).

(أبو ذر) وتی: براکەم چیت بینی؟ پیاوێکی چۆن بوو؟ چی دەوت؟

براکەشی وتی: بەخوا پیاوێکی زۆر باش بوو، فەرمانی دەکرد بە خەڵک تا چاکە بکەن و خراپە نەکەن.

بەڵام (أبو ذر) بەوە دڵی نەحەسایەوە و بڕێک ئاو و گۆچانێکی گرتە دەست و بەرەو (مكة) کەوتە ڕێ، تا گەیشتە (مكة). لەوێ حەزی نەکرد لای هەر کەسێک پرسیار لەبارەی پێغەمبەرەوە (ﷺ) بکات.

بۆیە لە کەعبە مایەوە و لە ئاوی زەمزەمی دەخواردەوە، لەوێ

مایەوە، تا ئەوەی (علي بن أبوطاليب) هات بۆ ئەویٚ و (أبو ذر)ی بینی، وتی: ئەمە کەسێکی بێگانەیە، پرسیاری کرد وتی: تۆ خەڵکی ئێرە نیت؟

وتی: نا خەڵکی ئێرە نیم،

پێشەوا (علي) بردیەوە بۆماڵی خۆیان و خزمەتی دەکرد بیٚ ئەوەی پرسیاری لێبکات.

بۆ بەیانی بە هەمان شێوە چوویەوە بۆ کەعبە و پرسیاریشی لە کەس نەدەکرد، دووبارە پێشەوا (علي) دای بەلایدا، پرسیاری لێکرد بۆچی نەگەڕاویتەتەوە، ئایا لێرە ئیشت هەیە؟

(أبو ذر) وتی: ئەگەر ئاشکرام نەکەیت، پێت دەڵێم ئیشم چییە.

(علي) وتی: باشە.

(أبو ذر)یش وتی: بیستوومە لێرە پێغەمبەرێک دەرکەوتووە، دەمەوێت هەواڵی بزانم.

پێشەوا (علي) وتی: زۆر باش بوو لە منت پرسی، دەی بەدوای مندا وەرە. ئەگەر بینیم مەترسییەک هەیە و خەڵکێک چاوی لێمانە من دەوەستم بە بیانووی چاککردنی نەعلەکەم و تۆیش برۆ، تا پێمان نەزانن. (أبو ذر)یش وتی: باشە.

پێکەوە بەدوای یەکتردا کەوتنە ڕیٚ، تا چوونە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، (أبو ذر) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا باسی ئیسلامم بۆ بکە، پێغەمبەریش(ﷺ) بۆی باسکرد. (أبو ذر)

هێندە شەیدا و سەرسامی فەرموودەکانی بوو یەکسەر لەوێدا موسڵمان بوو.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی (أبو ذر) موسڵمان بوونت ئاشکرا مەکە و بگەڕێرەوە بۆ ناو هۆزەکەت هەرکات بیستت ئێمە دەرکەوتوین وەرە، (أبو ذر) هێندە شەیدای ئایینەکەی بوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا سوێند بەخوا لەناو ئەو بێباوەڕانەدا هاوار دەکەم کە موسڵمان بووم. (أبو ذر) چوویە کەعبە و لەناو هەموو بێباوەڕاندا هاواری کرد و وتی: ئەی قورەیشیەکان بزانن من موسڵمانم، ئەوانیش کەوتنە لێدانی و هێندە ئازاریاندا خەریک بوو بیکوژن، تا ئەوەی خێرا (عباس)ی مامی پێغەمبەر(ﷺ) چوو فریای کەوت و خۆی دا بەسەر (أبو ذر)دا و بە قورەیشیەکانی وت: قوڕتان بەسەر ئەتانەوێت کەسێک لە هۆزی غیفار بکوژن؟ مەگەر نازانن هەرچی کاروانی ئێوەیە بەناو هۆزی غیفاردا دێتەوە؟ ئەوانیش ئەوەیان بیست یەکسەر وازیان لێهێنا.

(أبو ذر) شەو لە (مكة) مایەوە و بەیانیش دووبارە هەمان شتی کرد، بێباوەڕەکانیش کەوتنەوە لێدانی، بەڵام دووبارە (عباس)ی مامی پێغەمبەر(ﷺ) هاتەوەو ڕزگاری کرد.

(أبو ذر) چوو و خوێنەکەی سەر لەشی خۆی لابرد و دەست و دەموچاوی شۆرد و تێر لە ئاوی زەمزەمی خواردەوە، لەو کاتەدا

پێغەمبەر(ﷺ) هات و تەوافی کەعبەی کرد و نوێژی کرد، دواتر (أبو ذر) سەلامی کرد لە پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەریش(ﷺ) وەڵامی دایەوە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی چەندێکە لێرمیت؟

وتی: سێ شەو و ڕۆژە لێرەم و تەنها لەم ئاوە دەخۆمەوە.

پێشەوا (أبوبکر) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ڕێم بدە من ئەمشەو نانی بۆ ئامادە بکەم.

ئەوە بوو (أبوبکر) و پێغەمبەر(ﷺ) و (أبو ذر) چوون و نانیان خوارد.

**پەند و ئامۆژگاری:**

١- دەبێت ئەگەر لەناو کەسانی خراپیشدا بین ئێمە وا نەکەین، بەڵکو دەبێت هەوڵ بدەین ئەوان چاک بکەین وەک چۆن (أبو ذر)ی غیفاری هەوڵیدا دووربێت لە خراپەکاری ناو هۆزەکەی.

٢- هەردەم هەوڵ بدەین بەدوای چاکە و ڕاستیدا بگەڕێین وەک چۆن (أبو ذر) هەر لەگەڵ ئەوەی هەواڵی پێغەمبەر(ﷺ)ی بیست چوو بۆ لای و لەو پێناوەشدا برسێتی و ئازار و لێدانی چەشت و خۆڕاگرانە وەستا.

٣- برسێتی دەروون و دڵی مرۆڤ زۆر سەختترە لە برسێتی جەستە، بۆیە دەبێت بە یادی خوا برسێتی دل و دەروونمان نەهێڵین وەک چۆن (أبو ذر) سێ ڕۆژ نانی نەخوارد، تا بتوان برسێتی دل و دەروونی بە ئیسلام نەهێڵێت.

٤- دەبێت موسڵمان دلێر و نەترس بێ و لەپێناو خوادا بەرگەی هەر ئازار و ناڕەحەتیەک بگرێت.

(أبو ذر الغفاري) گەڕایەوە بۆ ناو هۆزەکەی و لەگەڵ براکەیدا کەوتنە بانگەوازکردن بۆ ئیسلام، تا ئەوەی نیوەی هۆزەکەیان موسڵمان بوون، نیوەی تریشیان وەستان، تا پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ (مدینة) ئەوکات هەموویان موسڵمان بوون.

(أبو ذر) بە خواپەرستی و دنیانەویستیەوە ژیا و لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا بەشداری غەزاکانی بەدر و ئوحود و خەندەقی کرد.

(أبو ذر) هەمیشە لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)دا بوو و پێغەمبەری خواش تەواو (أبو ذر)ی خۆش دەویست، هەمیشە (أبو ذر)ی دەچواند بە پێغەمبەر (عیسی)، وەسیەتی کاری چاکی دەکرد بۆ (أبو ذر) و فەرمانی پێدەکرد هەژارانی خۆشبوێت و چاوی لە کەسانی لە خۆی هەژارتر بێ و داوای هیچ لە کەس نەکات و پەیوەندی خزمایەتی هەبێت و قسەی حەق بکات و

لەبەر خوا گوێی لەسەرکۆنەی خەڵک نەبێت.

لە غەزای تەبووکدا پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵان بە گەرماوە چوون بۆ جیهاد، بەڵام (أبو ذر الغفاري) دواکەوتبوو، بە تەنها و بە پێ کەوتە ڕێ، کەسێک لە دوورەوە بینی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا وا کەسێک بەپێ دێت. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵکو (أبو ذر) بێت. کە سەیریان کرد وتیان:(أبو ذر)ە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ڕەحمەتی خوا لە (أبو ذر) بە تەنها دەچێت و بە تەنها دەمرێت و بە تەنهاش زیندوو دەبێتەوە).

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی: کرد (أبو ذر الغفاري) تەواو دڵگران و بێتاقەت بوو، بەڵام بەردەوام بوو لە خواپەرستی و دنیانەویستی، بەوشێوەش لە سەردەمی پێشەوا (أبوبکر) و (عمر)دا ژیا.

لە سەردەمی پێشەوا (عثمان)دا چوو بۆ ناوچەیەک کە پێی دەوترا (ڕەبزە)، لەوێ بە تەنها مایەوە و سەرقاڵی خواپەرستی بوو، تا ئەوەی لەوێ کۆچی دوایی کرد، لەکاتی مردنیدا تەنها ژنەکەی و منداڵەکانی لەگەڵیدا بوون.

لەو کاتەدا (عبدالله بن مسعود) لە عێراقەوە لەگەڵ کۆمەڵێک هاوەڵەوە دەهاتەوە، نوێژیان لەسەر کرد و تەرمەکەیان ئەسپەردە کرد، پێشەوا (عثمان)یش ژن و منالەکانی برد بۆ لای خۆی و سەرپەرشتی دەکردن، ئەمەش واتای ئەوەیە خۆشەویستی

لەنێوان پێشەوا (عثمان) و (أبو ذر الغفاري) دا زۆربووە و هەستی بەرپرسیارێتییان بەرانبەر بە یەکتر هەبووە. بەڕاستی ئەوانیش گەورەترین سەرمەشقن بۆ ئێمە، تا هەردەم بەدەم یەکتریەوە بین و لە خۆشی و سەختیەکانیشدا پێکەوە بین.

**پرسیارەکان:**

١-هۆزی غیفار بەچی ناسرا بوون؟

٢- (أبو ذر الغفاري) چۆن موسڵمان بوو؟

٣- هۆزی غیفار چۆن موسڵمان بوون؟

٤- باسی خۆڕاگری (أبو ذر الغفاري) لەپێناو ئیسلامدا بکە.

٥- ئامۆژگاریەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ (أبو ذر الغفاري) چی بوون؟

٦- باسی مردنی (أبو ذر الغفاري) بکە.

٧- گرنگترین ئەو شتانەی لەم چیرۆکەوە فێریان بوویت چین؟

## ٣٤- (زید بن ثابت)

(زید بن ثابت) منداڵێکی بچووک و ژیر بوو کە لەگەڵ دایک و باوکیدا لە شاری (مدینة) دەژیا، (زید) زۆر زیرەک بوو و زوو هەستی بە شتەکان دەکرد و لەبەرکردنی زۆر باش بوو. دایکی (زید)یش ئافرەتێکی ژیر و تێگەیشتوو بوو، باوکیشی ڕۆژانە دەچوو بۆ ئیش و بژێوی ژیانی دابین دەکرد، باوکی (زید) لە هۆزی بەنی نەجار بوو، بۆیە (زید)یش دەبوو بە کەسێک لە بەنی نەجار.

ڕۆژێکیان باوکی (زید) چوویە دەرەوە و لە (مدینة) جەنگێک ڕوویدا، جەنگەکە هێندە گەورە بوو لای هەمووان ناسراو بوو و پێی دەوترا جەنگی بوعاس.

لەو جەنگەدا باوکی (زید) کوژرا، بەوەش (زید) هەتیوو و بێ باوک کەوت و لەگەڵ دایکیدا بە تەنها ژیانیان بەسەر

دەبرد، بەڵام دایکی (زید) هێندە ژیر و تێگەیشتوو بوو نەیدەهێشت (زید) هەست بە تەنیایی بکات.

پرسیار: ئەی (زید) کەی موسڵمان بوو؟

وەڵام: کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی کرد بۆ (مدینة) ئەوکات (زید) تەمەنی یانزە ساڵ بوو، خۆیشی و دایکیشی موسڵمان بوون و ڕوویان کردە ئایینی خوا.

(زید)ی منداڵ و ژیر خێرا دەکەوتە لەبەرکردنی هەر ئایەتێکی قورئان کە دەیبیست، بەمجۆرە (زید) ماوەیەک لە (مدینة)دا هەوڵی زانستی دەدا.

کاتێک جەنگی بەدر هاتەڕێ دایکی (زید) جلوبەرگ و پێویستی بۆ (زید) ئامادە کرد و وتی: کوڕەکەم بڕۆ لە پێناو ئایینی خوادا جیهاد بکە. (زید)یش خۆی زۆر تامەزرۆی جیهادی ڕێی خوا بوو، چوو و تکای کرد لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) تا ڕێی پێبدات بەشداری ئەو جەنگە بێت، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) کە سەیری کرد تەمەنی کەمە دڵی نەهات و ڕێی نەدا بەشداری جەنگ بکات و ناردیەوە بۆ ماڵەوە، (زید)یش بە خەفەتباری و دڵگرانییەوە چوویەوە بۆ لای دایکی و هەواڵی پێدا کەپێغەمبەر(ﷺ) ڕێی پێنەداوە بەشداری بکات و ناردوویەتیەوە بۆ ماڵەوە.

**پەند و ئامۆژگاری:**

١- دەبێت بەرگەی ناڕەحەتیەکانی ژیان بگرین وەک چۆن (زید) بەرگەی مردنی باوکی گرت.

٢- دەبێت هەوڵ بدەین لەگەڵ ئەو کەسانەدا باش بین کە باوک، یان دایکیان مردون، تا هەست بە تەنیایی نەکەن.

٣- دەبێت گوێڕایەڵی فەرمان و ئامۆژگاری زانا و کەسە گەورە خواناسەکان بین وەک چۆن (زید) گوێڕایەڵی فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو.

دوای ئەوەی کە (زید) بە دڵگرانی گەڕایەوە ماڵ هەروا بێکار و دەستەوسان دانەنیشت، بەڵکو خێرا کەوتە لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز و وەرگرتنی زانیاری، تا کات بەفیڕۆ نەدات.

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە بۆ (مدینة)، دایکی (زید) بیری لەوە کردەوە (زید) بباتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) بۆیە (زید)ی برد بۆ لای چەند پیاوێکی هۆزەکەی و ناردی بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، تا لە خزمەتیدا بێ و زانستی لێ وەربگرێت.

پیاوەکان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (زید) کوڕێکی ژیر و زیرەکە و حەڤدە سوورەتی قورئانی لەبەرکردووە، با لە خزمەتی

تۆدا بێت، (زید)یش هەر حەڤدە سوورەتەکەی بە لەبەرکردنەوە خوێندەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و هەڵەی تێدا نەکرد، پێغەمبەری خواش (ﷺ) بەوە سەرسام بوو و ئەرکێکی نوێی ڕاسپارد بە (زید) تا ئەنجامی بدات.

پرسیار: پێغەمبەر(ﷺ) چ ئەرکێکی بە (زید) ڕاسپارد؟

وەڵام: پێغەمبەر(ﷺ) داوای لە (زید) کرد، تا فێری زمانی جولەکەکان بێت، چونکە دڵنیا نەبوو لە جوولەکە.

(زید)یش چوو دەستی کرد بە فێربوونی ئەو زمانە و لە ماوەی نیو مانگدا بە چاکی فێری زمانەکەیان بوو. (زید) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووم: ئایا بە چاکی زمانی سریانی دەزانیت؟

وتم: نا.

فەرمووی: دەی بڕۆ فێرببە. ئەویش چوو و بە ماوەی حەڤدە ڕۆژ بە چاکی فێری زمانی سریانیش بوو.

بەمجۆرە (زید) لە فێربوونی زمانەکاندا زۆر ئازا و خێرا و زیرەک بوو، ئیتر هەرچی نامەیەکی جوولەکە بهاتایە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ)، یان پێغەمبەر(ﷺ) بۆی بناردنایە ئەوا (زید) دەیخوێندەوە و دەینووسی، بەو جۆرە گەورەترین خزمەتی دەکرد بە پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانان.

## پەند و ئامۆژگاری:

١- دەبێت زۆر خۆمان سەرقاڵ بکەین بە خوێندنەوە و لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز و لێتێگەیشتنی وەک چۆن (زید) توانی لە ماوەیەکی کەمدا حەڤدە سورەتی قورئانی پیرۆز لەبەر بکات.

٢- پێویستە هەوڵ بدەین، تا دەتوانین خۆمان فێری زمانەکانی تر بکەین وەک زمانی عەرەبی و ئینگلیزی و چەندین زمانی تری پێویست وەک چۆن (زید) توانی بە ماوەیەکی کەم خۆی فێری زمانی جوولەکە بکات.

هێندەی نەبرد، تا پێغەمبەر(ﷺ) لەبەر ڕازی بوونی لە زیرەکی و ژیری و ڕاستگۆیی (زید) کارێکی بە (زید) ڕاسپارد کە ئەویش بریتی بوو لە: نووسینەوەی قورئانی پیرۆز. واتا کاتێک خوای گەورە ئایەتێکی نوێی دادەبەزاند بۆ سەر پێغەمبەر(ﷺ) (زید بن ثابت)دەینووسیەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، ئەمەش گەورەترین و گرنگترین ئەرکێک بوو کە (زید) بە جوانی ئەنجامی دەدا.

بەوجۆرە بەردەوام (زید) لە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)دا بوو و فەرمانەکانی جێبەجێ دەکرد و هەر ئایەتێکی نوێ داببەزیایە خێرا لەسەر پێستە دەینووسیەوە، تا ئەوکاتەی ڕۆژی کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) هات، ئیتر (زید) تەواو دڵگران بوو،

چونکە خۆشەویستترین کەسی بەجێ هێشت کە ئەویش پێغەمبەری خوا بوو.

دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاردرا خەلیفەی یەکەمی پێغەمبەر(ﷺ) دیاری بکرێت، کۆچەران حەزیان دەکرد خەلیفەی یەکەم لەوان بێت، پشتیوانانیش حەزیان دەکرد خەلیفەی یەکەم لەخۆیان بێت.

(زید) لەوێدا هەڵوێستی دلێرانە و ڕاستگۆیانەی نیشاندا و هەرچەندە خۆی لە پشتیوانان بوو، بەڵام وتی: دەبێت خەلیفەی یەکەم لە کۆچەران بێت، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) لە کۆچەران بوو، ئێمەش دەبینە پشتیوان و پاڵپشتی، بەمەش کێشەکەی یەکلاکردەوە.

دواتر خەلیفەی یەکەم کە پێشەوا (أبوبکر) بوو ویستی هەموو قورئانی پیرۆز کۆبکاتەوە و بینوسێتەوە.

پرسیار: پێشەوا (أبوبکر) بۆچی ویستی هەموو قورئان کۆبکاتەوە؟

وەڵام: چونکە خەریک بوو ئەو هاوەڵانەی هەموو قورئانیان لەبەربوو یەکە یەکە شەهید دەبوون، یان کۆچی دواییان دەکرد، بۆیە ویستی هەموو قورئان کۆبکرێتەوە و بنوسرێتەوە، تا بەڵێنی خوا بێتە دی و قورئان پارێزراو بێت، ئەمەش کارێکی زۆر گەورە و گرنگ بوو.

پێشەوا (أبوبکر) و پێشەوا (عمر) زۆر بیریان کردەوە بزانن کێ بۆ ئەم کارە شیاوە، دوای ڕاوێژ و بیرکردنەوەیەکی زۆر بۆیان دەرکەوت چاکترین و شیاوترین کەس بۆ ئەم کارە (زید بن ثابت)، چونکە ئەو لە سەردەمی پێغەمبەریشدا (ﷺ) نووسەرەوەی قورئانی پیرۆز بوو و پێغەمبەریش(ﷺ) زۆر لێی دڵنیا بوو.

کاتێک ئەمەیان بە (زید) وت (زید) زۆر بێتاقەتی دایگرت، چونکە ئیشێکی زۆر زۆر سەخت بوو و وتی: ئەگەر هەڵگرتنی هەموو شاخەکانیان بەسەر شاندا بدامایە هێندەی ئەمە لەلام سەخت نەدەبوو، بەڵام کاتێک زانی ئەو کارە پێویستە جێبەجێ بکرێت زۆر بە دڵسۆزانە دەستی پێکرد و بە جوانی هەموو قورئانی پیرۆزی کۆکردەوە و هەمووی نووسییەوە و لە یەک بەرگی تەواودا دایە دەستی پێشەوا (أبوبکر)و ئەرکەکەی خۆی تەواو کرد، ئیتر لەو کاتەوە هەر کەسێک قورئان بخوێنێت بەردەوام خێریش بۆ (زید) دەنووسرێت، چونکە ئەو نووسیویەتییەوە.

دوای تەمەنێکی پڕ لە خزمەتکردن بە ئیسلام و موسڵمانان ڕۆژی مردنی (زید) هات و ژیانی دنیای بەجێهێشت و گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاری، هەموو موسڵمانانیش تەواو دڵگران بوون بە مردنی.

**پەند و ئامۆژگاری:**

١- دەبێت بەردەوام لە خزمەتی قورئانی پیرۆزدا بین، چونکە ئەوە گەورەترین چاکەیە.

٢- ئەگەر ئەرکێکی دروست و چاکمان پێ سپێردرا، دەبێت لێی نەترسین و دلێرانە لێنەوین و بەچاکی ئەنجامی بدەین.

**پرسیارەکان**

١-ژیانی پێش موسڵمان بوونی (زید) چۆن بوو؟

٢- بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) نەیهێشت (زید) بەشداری جەنگی بەدر بکات؟

٣- گرنگترین ئەرکەکانی (زید) کە پێغەمبەر(ﷺ) پێی ڕاسپارد چی بوون؟

٤- (زید) لە سەردەمی پێشەوا (أبوبکر)دا چ ئەرکێکی بەجێگەیاند؟

٥- ڕۆژانە چەندێک قورئان لەبەر دەکەیت؟

٦-ئایا ئامادەیت وەک (زید) دەست بکەیت بە لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز؟

# ٣٥- (كعب بن مالك)

ئەمجارەیان لە خزمەت هاوەڵێکی خۆشەویستی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دەژین کە ئەویش (کعب بن مالک) بوو. (کعب) پیاوێک بوو لە پشتیوانان و شاعیرێکی بەهێزی پێغەمبەری خواش بوو. ئەو کەسە بوو کە هەڵەیەکی کرد بەوەی لە جەنگێکدا دواکەوت، تا خوای گەورە ئایەتی لەسەر دابەزاند و لێی خۆش بوو، پێغەمبەری خوایش خۆشی دەویست و (کعب)یش، تا مرد دڵی پڕ بوو لە خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ).

(کعب بن مالک)ی خەزرەجی بوو. ئەم پیاوە لە شاری (مدینة)دا دەژیا، شاعیرێکی زۆر بەهێز و زمانپاراو بوو، خەڵکی سەرسامی شیعرەکانی دەبوون.

جارێکیان (کعب) لەگەڵ ژمارەیەک لە خەڵکی (مدینة)دا چوو بۆ (مکة)، تا حەجی سەردەمی خۆیان لەسەر ئایینی خۆیان ئەنجام بدەن. لەوێ هەواڵی هاتنی پێغەمبەری خوایان بیست، بۆیە

لە شوێنێک کە پێی دەوترێت عەقەبە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا دانیشتن و لەوێ موسڵمان بوون و بەیعەتیان پێدا. بەوجۆرە (کعب) یەکێک بوو لەو حەفتا کەسەی (مدینة) کە لە پێش خەڵکی تری (مدینة) موسڵمان بوون.

دوای ئەوەی (کعب) گەڕایەوە بۆ (مدینة) بە گەرموگوڕیەوە کەوتە بانگەواز کردن بۆ ئاینی خوا. دەچوو بۆ لای دۆست و کەسەکانی و باسی ئیسلامی بۆ دەکردن، شیعری بەهێز و جوانی لەسەر پێغەمبەر(ﷺ)و ئیسلام دەوت و شیعرەکانی دەبوونە هۆی موسڵمان بوونی خەڵکی، تەنانەت جار هەبوو بە یەک دێڕە شیعر کە دەیوت کەسێک دەهاتەوە هۆش و موسڵمان دەبوو.

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی کرد بۆ (مدینة) (کعب) چوویە خزمەتی و بەردەوام دەچوو بۆ مزگەوتەکەی پێغەمبەر(ﷺ)و دواجار بوو بە یەکێک لە ئەندامانی صوففە و بەردەوام لە مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ)دا دەبوو.

(کعب) لە شیعرەکانیدا زۆر بە جوانی باسی جیهادی ڕێی خوای دەکرد، هاوکات دوو شاعیری تریش لەگەڵ (کعب)دا شیعریان دەوت بۆ پێغەمبەر(ﷺ) کە ئەوانیش بریتی بوون لە (حسان بن ثابت) و (عبدالله بن رواحة) ئەم سیانە بەردەوام بە شیعرەکانیان بەرگرییان لە ئیسلام دەکرد.

زۆربەی شیعرەکانی (کعب) سەبارەت بە جەنگ و جیهاد

بوون، بەڵام (حسان) زیاتر باسی کەموکورتی دوژمنانی ئیسلام و گەورەیی ئیسلامی دەکرد، (عبدالله)ش زیاتر لەسەر گەمژەیی عەقڵی بێباوەڕان شیعری دەوت و سەرکۆنەی دەکردن لەسەر ئەوەی کە بێباوەڕن.

(کعب) لە جەنگی ئوحوددا بەشدارییەکی دلێرانەی کرد و ئەوپەڕی توانا و هێزی خۆی بەکارهێنا بۆ لێدانی دوژمنان، کاتێک لە جەنگەکەدا موسڵمانان شکان و هەواڵ بڵاوبوویەوە وتیان: پێغەمبەری خوا کوژراوە یەکەم کەس کە پێغەمبەری خوای بینی (کعب) بوو و هەواڵی دڵخۆشکەری دا بە موسڵمانان و وتی: موژدە، پێغەمبەری خوا زیندووە و نەکوژراوە. ئیتر وزە کەوتەوە ئەژنۆی موسڵمانان و سەر لەنوێ لێنەوین، (کعب) کەوتە بەرگریکردن لە پێغەمبەر(ﷺ)و هێندە بە سەختی جەنگا، تا ئەوەی لە حەڤدە شوێنەوە بریندداربوو.

**پەند و ئامۆژگاری:**

١- پێویستە بەردەوام بانگەواز بکەین بۆ ئایینی خوا با تەنانەت تەنها بە یەک ئامۆژگاریش بێت، چونکە زۆرجار بە ئامۆژگارییەکی تۆ کەسێک سوودمەند دەبێت و لە خراپە دوور دەکەوێتەوە.

٢- هەر کەس دەتوانێت لە چ بوارێکدا بەهێزە لەو بوارەدا خزمەت بکات بە ئیسلام، هەیە بە شیعر هەیە بە نووسین هەیە بە کردار هەیە بە وتار، هەیە بە پارە، هەیە بە هێز، هەیە بە نزا یان.....هتد.

٣- بەرگەگرتنی ناڕەحەتیەکان لەپێناو خوادا پاداشتی ڕۆژی دوایی هەیە وەک چۆن (کعب) لە جەنگی ئوحوددا لە حەڤدە لاوە بریندار کرابوو.

(کعب) بەردەوام لە غەزا و جەنگەکاندا لەگەڵ پێغەمبەری خوا دا(ﷺ) بەشداری دەکرد و دوا نەدەکەوت، تا ئەوەی ئەمجارەیان جەنگێکی نوێ هاتە ڕێ کە سەختترین جەنگ بوو و بە ڕۆژی سەختی ناودەبرا. ناوی ئەو جەنگەش بریتی بوو لە جەنگی تەبووک. کاتێک ئەم جەنگە ڕوویدا کە بەرووبووم تازە پێدەگەیشت، گەرمایەکی زۆر سەخت بوو، ڕێگەکەش تەواو دوور بوو.

پرسیار: بۆچی ئەو جەنگە ڕوویدا؟

وەڵام: چونکە ڕۆمەکان دەیانویست هێرش بهێننە سەر پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانان و لەناویان ببەن، پێغەمبەریش(ﷺ) بڕیاریدا بەریان پێ بگرێت.

ئەوە بوو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد، هەموو موسڵمانان خۆیان ئامادە بکەن، تا بچن بۆ ئەو جەنگە، موسڵمانانیش

بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە خۆیان ئامادەکرد. دووڕووەکانیش دەچوون و بیانوویان دەهێنایەوە و دەیانوت ناتوانین بێین، پێغەمبەریش(ﷺ) ڕێی لێ نەدەگرتن.

هەندێک لە موسڵمانانیش لەبەر نەبوونی چەک و هیچ پێویستیەک نەیاندەتوانی بچن و لەبەر ئەوەش لە دڵگرانیدا دەستیان دەکرد بە گریان. پێشەوا (عثمان) و چەند کەسێکی تر هەوڵیاندا پێداوێستی بۆ هەندێکیان دابین بکەن.

بەڵام لەو نێوەندەدا (کعب) تەمبەڵی نواند و لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا نەچوو، هەروەها دوو کەسی تریش لە موسڵمانە ڕاستگۆکان، وەک (کعب) تەمبەڵییان نواند و نەچوون.

پرسیار: ئەو دوو کەسەی تر کێ بوون؟

وەڵام: ئەو دووانە بریتی بوون لە (مرارة بن الربیع) و (هلال بن أمیة).

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) هاتەوە (کعب) ویستی بچێت بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، هەرچی کرد نەیتوانی لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)دا درۆ بکات و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا هیچ بیانوویەکم نەبوو لە تەمبەڵیدا نەهاتم. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەو قسەیە ڕاستە. دەی، هەستە بڕۆ تا خوا بڕیارت لەسەر بدات.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد، موسڵمانان لەگەڵ ئەو سێ کەسەدا قسە و تێکەڵی نەکەن، تا خوا بڕیاریان لەسەر بدات، چونکە ئەوانە لە کاتی نارەحەتیدا لە فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی دەرچووبوون، ئیتر ئەو سێ کەسە بەردەوام لەو بارەدا بوون و دەگریان و بێتاقەت و دڵگران بوون و دەپاڕانەوە، تا خوا لێیان خۆش بێت.

(کعب) بەردەوام دەچوو بۆ مزگەوت و نوێژەکانی دەکرد، بەڵام ئەو دوانەکەی تر هەر لە ماڵەوە بوون و دەگریان، (کعب) دەچوو بۆ هەر شوێنێک کەس وەڵامی نەدەدایەوە، تەنانەت پێغەمبەریش(ﷺ) وەڵامی نەدەدایەوە، چونکە هەڵەکەیان گەورە بوو و دەبوو تەوبە بکەن.

لەو کاتەدا پاشای (غسان) نامەیەکی ناردبوو بۆ (کعب) و دەیوت بیستوومە بەرپرسەکەت لێت زویرە و ناتدوێنێت، وەرە بۆ لای ئێمە، با سەرت بخەین، بەڵام (کعب) نامەکەی خستە ناو تەنوور و سوتاندی.

پەنجا شەو و ڕۆژ لەو بارەدا بوون، تا دوای پەنجا شەو دوای نوێژی بەیانی کەسێک هاواری کرد: (کعب) موژدەت لێبێ خوا لێت خۆش بوو. (کعب) لە خۆشیدا جلەکەی بەری کردە خەڵات بۆ ئەو کەسە و دوو کراسی تریشی لابوو ئەوانیشی پێدا، خێرا چوو بۆ مزگەوت و خەڵکی پیرۆزبایییان لێکرد.

(کعب) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لە بری ئەو تەوبەدا چی سامانم هەیە لە ڕێی خوادا دەیبەخشم. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەندێکی لای خۆت بهێڵەوە، بەوجۆرە خوای گەورە لەو تاوانەی خۆش بوو، ئەمەش تەوبەی ڕاست و دروستە.

ئیتر (کعب) تا ڕۆژی مردنی بەو تەوبە پاک و دروستەوە ژیا و چی تر ڕێی نەدەدا خۆشیەکانی ژیانی دنیا زیان بگەیەنن بە کارەکانی بۆ ڕۆژی دوایی.

**پەند و ئامۆژگاری:**

١- ئەگەر تاوانێکمان کرد بە جوانی تەوبە بکەین و ئیتر لێی نزیک نەبینەوە.

٢- نابێت هیچ کات درۆ بکەین و ئەوەی ڕاستە ئەوە بڵێین وەک چۆن (کعب) ئامادە نەبوو یەک درۆش بکات.

**پرسیارەکان:**

١- (کعب) چۆن موسڵمان بوو؟

٢- (کعب) چۆن بەرگری دەکرد لە ئیسلام؟

٣- لە جەنگی ئوحوددا (کعب) چەند جار بریندار بوو؟

٤- بۆچی (کعب) لە جەنگی تەبووکدا دواکەوت؟

٥- باسی تەوبە کردنەکەی (کعب) بکە.

٦- گرنگترین پەند و ئامۆژگاری لەم چیرۆکەدا فێریان بوویت چین؟

## ٣٦- (حكيم بن حزام)

(حكيم) ئەو هاوەڵەی پێغەمبەری خوا بوو کە لە پاڵ کەعبەدا لەدایکبوو و (خديجة)ی ژنی پێغەمبەری خواش پووری بوو. (حكيم) درەنگ موسڵمان بوو، بەڵام چاکەی زۆری هەبوو بۆیە هەرچەندە دەرفەتی کەم بوو، بەڵام هەموو ڕێگەیەکی دەگرتەبەر بۆ قەرەبووکردنەوە.

(حكيم بن حزام) بوو، (حزام) ئافرەتێکی بە هاوسەر گرتبوو و لە (مكة)دا دەژیان، سامان و پارەی زۆریان هەبوو، زۆر بە خۆشی دەژیان و چییان بویستایە لەبەردەستیاندا دەبوو. لەناو (مكة)شدا بەچاوی ڕێزەوە سەیر دەکردا.

ڕۆژێکیان ئەو ژنە بە سکپڕیەوە چوو بۆ لای کەعبە و لەوێ بە دەوری کەعبەدا دەهات و دەچوو، لەوکاتەدا ژانی منداڵبوونی بۆ هات و نەیتوانی بگەڕێتەوە ماڵەوە و هەر لە پاڵ کەعبەدا منداڵەکەی بوو، ئەو منداڵەش ناوی (حكيم) بوو.

منداڵێکی جوان و چاو گەش و ئێسک سووک بوو،

(حکیم) لەلای دایک و باوکی دەژیا و تەمەنی دەبردە سەر و فەقیری و نەبوونی نەدەچەشت. بەهۆی ڕێزی باوکی لە (مکة)دا خەڵکی زۆر ڕێزیان لە (حکیم)یش دەگرت و (حکیم)یش لەگەڵ باوکیدا بەشداری کۆڕ و دانیشتنەکان دەبوو.

(حکیم) هەر لە (مکة)دا زۆر پێغەمبەری خوای خۆشدەویست و سەرسامی ڕەوشتی جوان و گەورەیی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، لەو ماوانەدا لە (مکة) جەنگێک ڕوویدا کە بە جەنگی فوجار ناسرابوو، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) لەو جەنگەدا لەگەڵ مامەکانیدا بەشدار بوو. ئەو جەنگە کرا بۆ پشتیوانی هەژاران و دژایەتی ستەمکاران، لەو جەنگەدا باوکی (حکیم)یش بەشداری کردبوو، بەڵام باوکی (حکیم) لەو جەنگەدا کوژرا، بەوە (حکیم) باوکی لەدەست دا و لای دایکی دەژیا.

دەسەڵاتدارانی (مکة)ش وەک ڕێز دانانێک بۆ باوکی و لەبەر بەخشندەیی و چاکەکاری (حکیم) بڕیاریاندا (حکیم) بکەنە بەرپرسی (ریفادە) لە (مکة)دا کە لە کاتی حەجدا خواردن و پێویستی حاجیەکانی دابین دەکرد.

(حکیم)یش جیا لەو سامانەی بۆ ئەو کارە خرابوویە بەردەستی لە سامانی تایبەتی خۆیشی یارمەتی حاجیانی دەدا و خواردنی بۆ ئامادە دەکردن، ئیتر (حکیم) لەناو خەڵکدا بە بەخشندە و چاکەکار ناسرابوو.

جارێکیان (حکیم) سەد وشتری کرد بە خێر و دابەشی کرد

بەسەر خەڵکدا، جارێکی تریشیان (حکیم) بڕیاریدا ژمارەیەک کۆیلە ئازاد بکات. دەستی کرد بە کڕینی کۆیلە و سەد کۆیلەی کڕی و هەر هەموو کۆیلەکانی ئازاد کرد، ئیتر بەوە لای خەڵک خۆشەویست بوو.

بەڵام ئەوەی جێی سەرسوڕمان بوو (حکیم) هێشتا موسڵمان نەبوو بوو هەرچەندە زۆر پێغەمبەری خوای خۆشدەویست، کاتێکیش پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی کرد بۆ (مدینة) و دواتر جەنگی بەدر ڕوویدا بێباوەڕان (حکیم)یان ناچار کرد، تا لەو جەنگەدا بەشداری بکات، بەڵام تیایدا نەکوژرا و بەبێ باوەڕی نەمرد.

ڕۆژێکیان (حکیم) لە (مکة) جلێکی زۆر جوان و ناوازەی کڕی و وتی: ئەمە دەکەم بە خەڵات بۆ پێغەمبەری خوا، بۆیە لە (مکة)وە کەوتە ڕێ و چوو بۆ (مدینة) و چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا، پێغەمبەریش(ﷺ) پێشوازی لێکرد و ڕێزی گرت. (حکیم) وتی: ئەم جلەم کڕیوە و هێناومە، تا خەڵاتی تۆی بکەم، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) لێی وەرنەگرت. فەرمووی: ئەگەر پێت باشە، بە پارە لێت دەکڕمەوە، هەرچەندە (حکیم) هەوڵیدا بە دیاری پێی بدات، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) وەرینەگرت. (حکیم) زۆر حەزی دەکرد ئەو جلە جوانە لەبەری پێغەمبەر(ﷺ) دا ببینێت بۆیە ڕازی بوو و بە پارە پێی فرۆشت. پێغەمبەری خواش(ﷺ) لێی کڕی و کردیە بەر و پێی چوو بۆ

مزگەوت و بەو جلەشەوە وتاری هەینی فەرموو.

پرسیار: بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو دیاریەی لێ وەرنەگرت؟

وەڵام: چونکە (حکیم) بێباوەڕ بوو و ئامادە نەبوو موسڵمان بێت.

بەوجۆرە (حکیم) لە (مکة)دا ژیا و بەو شێوازە لەناو خەڵکدا ناسرابوو، تا ئەو کاتەی پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانان شاری (مکة)یان فەتحکرد، ئەوکات (حکیم)یش موسڵمان بوو و زۆر بە چاکی باوەڕی هێنا و کەوتە خزمەتکردنی ئیسلام و هەمیشە خەفەتی بۆ ئەوە دەخوارد بۆچی زووتر موسڵمان نەبووە.

(حکیم) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من لە سەردەمی نەفامی و بێباوەڕیدا هەندێ کاری چاکەم هەبوون ئایا ئێستا کە موسڵمان بووم ئەو چاکانەم فەوتاون؟ پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: کە ئەو چاکانەشی نەفەوتاون و لای خوا بۆی دەنووسرێن. (حکیم)یش بڕیاریدا و وتی: لە سەردەمی نەفامیدا چەند چاکەم کردبن، دەبێت هێندەش لە کاتی موسڵمان بوونمدا ئەنجام بدەم، بۆیە کەوتە کڕینی کۆیلە و ژمارەی کۆیلەکانی گەیاندە سەد کۆیلە و هەموویانی ئازاد کرد، هەروەها لەڕێی خوادا سەد ئاژەڵی کرد بە خێر، هەروەها جگە لەوەش خانوویەکی ناوداری ناو (مکة)ی کڕی و لەپێناو خوادا ئەوەشی کرد بە خێر.

پرسیار: ئەو خانووە ناسراوە کامە بوو؟

وەڵام: ئەو خانووە ناسراوە دارونەدوە بوو کە لای خەڵکی

(مكة) زۆر گەورە و گرنگ بوو و دەسەڵاتدارانی قورەیش تیایدا کۆبوونەوەیان دەبەست و بڕیارەکانیان دەردەکردن، هەر لەو خانووەشدا بوو پێشتر بێباوەڕان بڕیاریان دابوو پێغەمبەری خوا بکوژن، بەڵام (حكيم) دوای موسڵمان بوونی بە پارەیەکی زۆر ئەو خانووەی کڕی و لەڕێی خوادا کردی بەخێر.

جارێکیان (حكيم) داوای سامانی کرد لە پێغەمبەری خوا، ئەویش پێی بەخشی، هەمتر داوای کرد و پێغەمبەر(ﷺ) پێی بەخشی، ئینجا (حكيم) سوێندی خوارد جگە لە پێغەمبەر(ﷺ) سامان لە کەس وەرنەگرێت. ئیتر تا ئەو ڕۆژەی مرد، تەنانەت ئەو بەشەی خۆیشی وەرنەدەگرت کە خەلیفەکان بۆیان دانابوو، هەرچەندە پێشەوا (أبوبكر) و (عمر) پێیان دەوت بەشەکەی خۆی وەرگرێت، ئەو دەیوت بەڵێنم داوە جگە لە پێغەمبەر(ﷺ) پارە و سامان لە هیچ کەسی تر وەرنەگرم، ئەو بەڵێنەشی بەتەواوەتی بردەسەر.

بەوجۆرە هەرچەندە (حكيم) درەنگ موسڵمان بوو، بەڵام نەیدەهێشت هیچ کاتی لەدەست بچێت و بەردەوام لە پەرستش و کاری چاکە و خزمەتکردن دا بوو بە ئیسلام و زیاتر لە چل ساڵ بە موسڵمانی ژیا، تا ئەوەی دوای زیاتر لە سەد ساڵ تەمەن لە جێگەدا نەخۆش کەوت و سەرەمەرگی هات، لەو کاتەدا وتی خوایە، تا ئێستا ترسم لە تۆ هەبووە، بەڵام لە ئێستاوە هیوا و ئومێدم پێت هەیە، تا بمپارێزی، ئیتر کۆچی دوایی کرد.

**پەند و ئامۆژگاری:**

١- کاری چاک و بەخشندەیی و بەڕێزی لای خەڵک خۆشەویست و بەڕێزمان دەکات.

٢- هەرچەندە لە ڕابردوودا خراپ بووبین ئەوا دەرفەت هێشتا ماوە و دەتوانین قەرەبووی ڕابردووش بکەینەوە وەک چۆن (حکیم) دەستی پێکرد و زۆر بە چاکی قەرەبووی ڕابردووی دەکردەوە.

**پرسیارەکان**

١- باوکی (حکیم) چۆن مرد؟

٢- (حکیم) لە (مکة)دا چ ئەرکێکی پێ درا؟

٣- باسی خەڵاتەکەی (حکیم) بۆ پێغەمبەر(ﷺ) بکە.

٤- بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) خەڵاتەکەی (حکیم)ی وەرنەگرت؟

٥- (حکیم) کەی موسڵمان بوو؟

٦- (حکیم) لە سەرەمەرگیدا چی وت؟

٨- بۆچی (حکیم) سامانی لە پێشەوا (أبوبکر) و پێشەوا (عمر) وەرنەدەگرت؟

## ٣٧- (حارثة بن النعمان)

(حارثة بن النعمان) بوو و دایکیشی ناوی (جعدة) بوو، (حارثة) لەگەڵ دایک و باوکیدا لە (مدینة)دا ژیانی دەبردەسەر و کەسێکی زۆر نەرمونیان و بەسۆز بوو، بە کەسێکی چاکەکار و ڕەوشت جوان ناسرابوو.

کاتێک هەندێک لە موسڵمانانی (مدینة) لە عەقەبەی دووەم گەڕانەوە و پێغەمبەری خوایش(ﷺ) (مصعب بن عمیر)ی نارد، تا لە (مدینة)دا خەڵکی فێری ئیسلام بکات. (حارثة)ش خێرا چوو بۆ لای و گوێی لە وتەکانی گرت و سەیری کرد ئایینی ئیسلام دروستترین ئایینە و ئەوەی ئەو بۆی دەگەڕێت لە ئیسلامدا هەیە، بۆیە خێرا لەوێدا باوەڕی هێنا و موسڵمان بوو.

بەڵام (حارثة) هێشتا دڵتەنگیەکی مابوو، چونکە هێشتا دایکی موسڵمان نەبوو بوو، بۆیە هەوڵیدا دایکیشی موسڵمان بێت. چونکە (حارثة) بەوە ناسرابوو کە زۆر دایکی خۆش دەویست و هێندە لای خۆشەویست بوو کە لە هەموو شتێکدا بە

گوێی دەکرد، تەنانەت ڕووی نەبوو قسەیشی پێ دووبارە بکاتەوە.

ئەو ئاواتەی (حارثة) هاتە دی کاتێک (جعدة)ی دایکی گوێی گرت لە ڕێنماییەکانی ئیسلام و باوەڕی پێهێنا، ئیتر (حارثة) لەوپەڕی خۆشی و کامەرانیدا بوو، چونکە لەگەڵ موسڵمانبوونی دایکیدا هەموو ژن و منداڵەکانی ئەو خێزانە موسڵمان بوون، بەوەش خوای گەورە هەموویانی لە گومڕایی و نەزانی ڕزگارکرد.

کاتێک هەواڵی ئەوە بڵاوبوویەوە پێغەمبەر(ﷺ) دێت بۆ (مدینة) ڕۆژانە (حارثة) لەگەڵ خەڵکی دا دەچوویە دەرەوە بۆ پێشوازی پێغەمبەر(ﷺ)، تا ئەوەی دواجار بە دیداری پێغەمبەری خوا شاد بوو، ئیتر بەردەوام دەچوو بۆ لای پێغەمبەری خوا و زانیاری و ڕێنمایی لێ وەردەگرت، پێغەمبەری خوایش کەڕەوشتی بەرزی (حارثة)ی بینی زۆر خۆشی ویست و بەچاوی ڕێزەوە سەیری دەکرد.

(حارثة) لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بەشداری جەنگی بەدر و ئوحودیشی کرد و زۆر سوور بوو لەسەر پاراستنی پێغەمبەری خوا.

(حارثة) هێندە حەزی دەکرد هەموو شتێك بە حەزی پێغەمبەری خوا بێت و حەزی دەکرد خۆشی ببەخشێت بە پێغەمبەری خوا. کاتێک پێشەوا (علي) (فاطمة)ی کچی

پێغەمبەری(ﷺ) بە هاوسەرگرت (حارثة) خانووەکەی خۆی چۆڵکرد بۆ (علي) و (فاطمة)، تا لە نزیک پێغەمبەری خواوە بن، چونکە (حارثة) دەیزانی پێغەمبەر(ﷺ) حەزدەکات (فاطمة) و (علي) نزیک بن لێوەی.

هەروەها کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) (صفية)ی بە هاوسەرگرت بردیە یەکێک لەماڵەکانی (حارثة)، چونکە (حارثة) ئەو خانووەی چۆڵکرد بوو بۆ پێغەمبەری خوا، بەمەش (حارثة) هەموو تواناى خۆی خستبووە گەڕ بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ).

ڕۆژێکیان (حارثة) دای بە لای پێغەمبەری خوادا و سەیری کرد کەسێکی لەگەڵ دایە، (حارثة) سەلامی کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) و هاوڕێکەی و ئەوانیش وەڵامیان دایەوە، ئینجا (حارثة) چوو، دوایی گەڕایەوە و چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەو کەسەت بینی کە لەگەڵ مندا بوو؟

وتی: بەڵێ.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی ئەوە (جبريل) بوو و وەڵامی سەلامەکەشی دایتەوە.

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) باس لەوە دەکات کاتێک لە شەوی شەو ڕەویدا چووەتە بەهەشت، لەوێ گوێی لە دەنگی (حارثة) بووە کە قورئانی خوێندووە، ئەوەش موژدەیەکی گەورە بوو بۆ (حارثة).

ئیتر (حارثة) هەمیشە لە خزمەتی ئایینی ئیسلامدا لێنەویبوو و ئامادە بوو لەو پێناوەدا هەر هەوڵێک بدات، لە هەموو جەنگ و غەزاکاندا بەشداری دەکرد. دواتریش کە جەنگی حونەین ڕوویدا موسڵمانان کەوتنە بۆسەی دوژمنەوە و شکان و هەموو موسڵمانەکان ڕایاندەکرد، بەڵام سەد موسڵمان لە دەوری پێغەمبەر(ﷺ)دا مانەوە و پارێزگارییان لێدەکرد، یەکێک لەوانەش (حارثة) بوو کە بەردەوام لە دەوری پێغەمبەر(ﷺ)دا بوو و بە جەستە و گیانییەوە دەیپاراست.

دوای جەنگەکە پاش ماوەیەک (جبریل) هات بۆلای پێغەمبەری خوا، شێوەی لە شێوەی کەسێکدا بوو. لەوکاتەدا (حارثة) دای بەلایاندا، ویستی سەلام بکات، بەڵام وتی: لەوانەیە سەرقاڵ بن، با کاتیان نەگرم، بۆیە چوو، لەو کاتەدا (جبریل) پرسیاری کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی (محمد) ئەوە کێیە؟ فەرمووی: (حارثة بن النعمان)، (جبریل) وتی: (ئەو یەکێکە لە سەد خۆڕاگرەکەی ڕۆژی حونەین کە خوای گەورە ڕۆزی ئەوانی لە بەهەشتدا دابین کردووە، ئەگەریش سەلامی بکردایە وەڵاممان دەدایەوە).

بەوجۆرە (حارثة) دووجار (جبریل)ی گەورە فریشتەی خوای گەورەی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا بینی.

**پەند و ئامۆژگاری:**

١- ڕەوشتی بەرز و ڕێزگرتنی کەسەکان دەبێتە هۆی ئەوەی ئێمەش لای هەموان بەڕێز و خۆشەویست بین بە تایبەت لەلای خوای گەورە.

٢- ئەگەر فێری کارێکی چاک بووین هەوڵ بدەین کەسە ئازیزەکانیشمان فێر بکەین وەک چۆن (حارثة) کاتێک موسڵمان بوو هەوڵیدا دایکی و ژن و منداڵەکانی فێری ئەو چاکە و ڕاستیە بکات.

٣- دەبێت بە ماڵ و گیان و توانامانەوە لە خزمەت پێغەمبەری خوا و ڕێبازەکەیدا بین.

پرسیار: گرنگترین ئاکارێکی جوان کە(حارثة)ی پێ ناسرا بوو چی بوو؟

وەڵام: گرنگترین ئاکارێکی جوان کە(حارثة)ی پێ ناسرا بوو بریتی بوو: لە چاکەکردن لەگەڵ دایکیدا، بە جۆرێک دایکی هەرچی بوتایە دەستبەجێ (حارثة)ی بۆی جێبەجێ دەکرد.

ئیتر لەگەڵ پێشەوا (عثمان)دا ناویان دەرکردبوو بەوەی زۆر لەگەڵ دایکیاندا چاکن، تەنانەت جاری وا هەبوو دایکی داوای شتێکی لە (حارثة) دەکرد، (حارثة)ش چاک لێی تێنەدەگەیشت، ڕووی نەبوو بڵێت دایە گیان دووبارەی بکەرەوە، بەڵکو پرسیاری لەو کەسانەی تر دەکرد کە لە و کاتەدا لای

دایکی بوون، دەیوت: ئەوە دایکم داوای چی کرد؟ ئەوانیش پێیان دەوت، ئەویش خێرا دەچوو کارەکەی بۆ جێبەجێ دەکرد.

(حارثة) بەو شێوەیە هەموو کارێکی خێر و چاکی ئەنجام دەدا، تا ڕەزامەندی خوا بەدەست بێنێت، لە سەردەمی خەلیفە ڕاشیدینەکانیشدا بە هەمان شێوە هەوڵی دەدا، بەڵکو لە سەردەمی پێشەوا (عثمان)دا کاتێک دوژمنان ویستیان هێرش بکەنە سەر ماڵی پێشەوا (عثمان) (حارثة) وتی: پشتت دەگرین و لەگەڵیان دەجەنگین.

بەڵام دواتر (حارثة) بەهۆی تەمەنی زۆر و ماندوێتیەوە بینایی لەدەستدا و هەردوو چاوی کوێر بوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وازی نەدەهێنا لەکاری چاکە، بەڵکو قاپێک خورمای لەگەڵ خۆی دەبردە بەر دەرگای ماڵی خۆی و لەوێ دادەنیشت هەر هەژارێک بهاتایە خورمای پێدەدا، هەرچەندە ژن و منداڵەکانی وتیان: ئێمە لەجیاتی تۆ ئەوە دەکەین، بەڵام (حارثة) وتی: هەر، دەبێت خۆم ئەم کارە بکەم.

(حارثة) بەوجۆرە ژیا، تا لە سەردەمی (معاوية بن أبوسفيان)دا کۆچی دوایی کرد.

**پەند و ئامۆژگاری:**

نابێ هیچ کات واز لە کاری چاکە بهێنین با تەنانەت دەست، یان چاو، یان قاچمان ئیش نەکات وەک چۆن (حارثة) لەگەڵ ئەوەی کوێر بووبوو کەچی وازی نەدەهێنا لە کاری چاکە.

**پرسیارەکان:**

١- (حارثة) بە چی ناسرا بوو؟

٢-(حارثة) چۆن موسڵمان بوو؟

٣- بینینی (جبریل) لەلایەن (حارثة)وە باس بکە.

٤- پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی (حارثة) چی فەرموو؟

٥- کاتێک (حارثة) چاوی کوێر بوو چی کرد؟

٦- ئایا تۆ هێندەی (حارثة) دایکت خۆشدەوێت؟

# ناوەڕۆك



ژیانـی هاوەڵانـی خۆشەویسـتمان بەڕاسـتی پێویسـتە بیانکەیـن بە سەرمەشق بۆ خۆمـان و منـداڵ و نەوەکانمـان، تـا ڕێی سەرفرازی بگرین.

لێـرەدا ژیانـی هاوەڵانمـان بـە نموونـە هێنـاوە و لـە شـێوەی گێڕانـەوەی ژیانیـان و پرسـیار و وەڵام و پەنـد و ئامۆژگاریـدا ژیانـی هـەرکام لەوانمـان هێنـاوە، دواجاریـش کۆمەڵێـک پرسـیارمان دانـاوە، تـا منداڵـی ئازیـز بـەدوای وەڵامەکانیانـدا بگەڕێت کەوەڵامەکانیشیان لە خودی ئەم نووسینەدا هەن.

بەو هیوایـەی خـوای گـەورە ئـەم کارەی لێوەرگرتبیـن و پـاک و پوخت تەنها لەپێناو خۆیدا بێت.

خەڵکیـش بـە گشـتی و منداڵـی موسـڵمان بـە تایبەتـی سوودی لێ ببینن





/TafseerOffice

نووسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر - شەقامی ٣٠مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 65
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com